# ڕەنگین



ژمارە(٨)ی حوزەیرانی ١٩٨٨

من باوەڕی و تەناعەت
بە فلاو بورجانینە - زێڕین



د. کمال مظهر:
ڕۆژنامەنووسی
کارێکی ئاسان نییە





پیرەمێرد:
حەبەزبزی چاوبزی تەلەم تاخی



# هێزی گەل و سەرکردەی قارەمان صدام حسین..

بۆ ماوەیەکی زۆر کورت و بۆ ئەوەی سەرکردەی گەل پاڵەوان صدام حسین بۆ گەلانی سەرزەمین دووپاتی بکاتەوە کە عیراقی‌یەکان هێزوتوا نایەکی بێ‌پایانیان هەیەو جڵەوی جەنگیان بەدەستەوەیە سێ هێرشی گەورەی کردەسەر دوژمنی داخ لەدڵ کە مەلایەکی هیچ و پووچ و گەوج فەرمانڕەواییان دەکات.

یەکەمین هێرش لە (فاو) بوو داستانێکی مێژوویمان بە کات و وەختێکی کەم دا تۆمار کرد، دوژمن لە ژێر پێی پاڵەوانەکانی قادسیەی دووەم دا تلانەوەو بە هەزارانیان ڕەوانەی دۆزەخ کران «فاو»مان گەڕاندەوە بەڵام چ جۆرە گەڕانەوەیەك مەگەر هەر دوژمن خۆی بزانێت سەربازەکانی صدام حسین چۆن گورزی کوشندە دەوەشێنن و چۆن ئەم بەچکە شێرانە هەڵمەت دەبەن. هێرشی دووەم کە لە شەلامچەو ئەوخاکە نازدارەدا ڕوویدا خومەینی‌و ڕەفسەنجانی‌و گشت مەلاو ئاخوندەکانی قوم و تاران تووشی سەریەشە بوون و بگرە گەلانی سەرزەمین بەوپەڕی ڕێزەوە باسی ئەم داستانە نەمرەدەکەن و بەوێنەی لە تەلەفزیۆنەکانیان شەڕەکەیان پیشان داوە، ئافەرین بۆ سەرکردەی قارەمان صدام حسین و سەربازە دلێرەکانی ڕەوانەکرد.

داستانی مێژوویی سێیەم کە هەر لەم چەند ڕۆژانەیەدا لە لاپەڕەی زێڕینمان دا تۆمار کرا، دورگەی مەجنون و هەموو پانایی‌یە ئاویی‌یەکانمان لە دوژمن پاك کرایەوە سەربازەکانی دوژمن وەکو مشك بۆ کون دەگەڕان بۆ ئەوەی خۆیان حەشار بدەن و لەمردن و ئاگری دۆزەخ خۆیان ڕزگار بکەن بەڵام ئەمجارە وەکو جارەکانی تر، دەست و بازوو گورزی سەربازەکانمان توندترو قورست تر بوو کوشتاری ئەمجارەی خومەینی‌یەکان لە ڕادەبەدەر بوو، بگرە تا ئەم کاتە دوژمن ئەوەندە شپرزە بووە، هێشتا نازانێت چ جۆرە بیانویەك بدۆزێتەوەو خۆی لەم دۆڕاندنە گەورەیە قورتار بکات.

لەڕاستی‌دا دوژمن ئێستا هیچی بۆ نەماوە کەپشتی پێ‌ببەستێ‌و لە شەڕەکەدا بەردەوام بێت و لە بارێکی پڕ نائومێدی‌و تاریکی‌دا دەژیت و کەوتنە یەکجاری‌یەکەی لە گۆڕەپانی جەنگ دا زۆر نزیك بۆتەوە.

● عادل حسن احمد ●

رەنگین
مجلة شهرية سياسية عامة
تصدرها
دار الثقافة والنشر الكردية
بغداد

رئيس التحرير
مصلح الجلالي



# رەنگین

کۆڤارێکی مانگانەی سیاسی گشتییە

سەرنووسەر: **مصلح جەلالی**






**لە لاپەڕەی سێیەمەوە**

## یادکردنەوەیەکی پیرەمێرد

ئەم ژمارەیەمان ژمارەی مانگی حوزەیرانە، لەنۆزەدی حوزەیرانی ١٩٥٠دا کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی ئەدەب و ڕۆژنامەنووسی کوردی (پیرەمێرد ١٨٦٧ - ١٩٥٠) ماڵ ئاوایی لێکردین.

پیرەمێرد نزیکەی سی ساڵی تەمەنی لە خزمەت ڕۆژنامەنووسی کوردیدا بەسەربردو هەزارو پانزدە ژمارەی لە(ژین) پێشکەش بەخوێنەری کورد کرد.

ئێمە بەو شادمانین کەبە دڵسۆزی پیرەمێردانەوە دەستمان داوەتە قەڵەم و لە کۆڕی ڕۆژنامە نووسی کوردیدا تێئەکۆشین و بۆ یادی ئەوپیرەمەردەش لەم ژمارەیەدا دوو نووسینی نووسەرانی بەرێزمان لەم گۆڤارە ڕەنگینەدا بڵاوئەکەینەوە

سکرتێری نووسین










سکرتێری نووسین **مصطفی نەریمان**

نرخی ٤٠٠ فلسە

**رەنگین**
**ناونیشان** بەغداد
دەزگای ڕوشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
وەزیریە، تەنیشت المعهد القضائي
ت ٤٢٥١٨٤٦ پێنج خەتە
سکرتێری نووسین: ٤٢٥١٠٢٥

دەرهێنانی هونەری: نزار بەزاز

**دار الحرية للطباعة**



**له یادی بیستەمی شۆڕش دا:**

# صدام حسین دروستکەری شۆڕش و سەرکردەی عیراقە بەرەو ئاوەڕەنگی بەرزی

له حەڤدەی مانگی تەمووزدا یادی بیستەمی بەرپا بوونی شۆڕشی پیرۆزی ١٧ - ٣٠ی تەمووز دەکەینەوە، ئەو شۆڕشەی ڕووی عیراقی له تاریکی‌یەوە بۆ ڕووناکی گۆڕی‌و توانی سەر له نوێ مێژووەکەی بنووسێتەوە، دوای ئەوەی دەردێکی زۆری ژێر دەستی‌و نامۆیی‌و دواکەوتنی چەشت.

ئەم شۆڕشە مەزنە دەرگایەکی گەورەی بەسەر ڕابردووی شکۆداری نیشتمان دا کردەوەو شارستانەتی‌و کەلەپووری گەشی ژیاندەوەو له هەموو لایەکەوە تینی‌دا بەر هیمەتی خەڵکەکە بۆ پەرەپێدان و سەرکەوتنی بەسەر بەرزترین پلەکانی شارستانی‌و پێشکەوتن دا.

ساڵ دوای ساڵیش بۆ ڕۆڵەکانی عیراق دەردەکەوێ کە ئەو دروشمانەی شۆڕش هەڵی‌کردبوون هەمووی بوون بە ڕاستەقینەیەکی بەرچاو، کە نموونەکەیان له دەیان پرۆژەی پەرەپێدان و ئاوەدان کردنەوەی وەهادا دیارە کە عیراقی وێرانەیان بە بەهەشتێکی دڵڕفێنی ئەوتۆ گێڕاوە بووەتە مایەی سەرسامی باس کردنی شوڕشی تەمووز، ڕامان دەکێشێت بۆ باسی بەرپاکەرو سەرکردەی شۆڕشەکە کە سەرۆکی بەڕێزمان (صدام حسین)ە، ئەو سەرکردەیەی ڕۆڵەی دڵسۆزو سەر ڕاستی گەلەو لەگەل خەم و پەژارەی گەل دا ژیاوەو بەچاوی خۆی هەژاری‌و برسیەتی‌و دواکەوتوویی ڕۆڵەکانی گەلی دیوەو خەم و پەژارەی نیشتمانەکەی له دڵ و دەروونی‌دا ژیاوە، بۆیە بڕیاری داوە تێبکۆشێ هەموو شێوەکانی ستەم و زۆرداری لەسەر عیراق لابەرێت، بۆ گۆڕینی ئەم بارەش تەنیا شۆڕشێکی لەسەر بناغەی بیروباوەڕی ڕەسەن دامەزراو دەتوانێ ئەم ئەرکە خەبات گێڕیە نیشتمانی‌یە بەجێ بگەیەنێت، ئیتر صدام حسین ی سەرکردە هەوڵ و هیمەتی هاوڕێ تێکۆشەرەکانی خۆی بۆ ئامادەیی بۆ قۆناغی داهاتوویی مێژوویی بە گەڕ خست و بەهێزی باوەڕو بە پشتیوانی نیشتمان نەخشەی شۆڕشی دانا ئەوەبوو له بەرەبەیانی ڕۆژی ١٧ی تەمووزدا پێشڕەوی تێکۆشەر لاپەڕەیەکی گەشیان له لاپەڕەکانی عیراق کردەوە تا له نوێوە مێژووەکەی بنووسنەوەو کوڕگەلی باوەڕ بە خوداو بەنیشتمان گیانی خۆیان خستە سەر دەست و بەدوو ئامانج ملیان نا، یان سەرکەوتنی شۆڕش و یان شەهیدبوون، ئەوەبوو خودا کارەکەیانی پیرۆز کردو سەرکەوتنی بۆ نووسین، جا هەر کە شۆڕش له ٣٠ی تەمووزدا، دوای ئەوەی

بێگانەکانی لەناوبرد، پێی خۆی چەسپاند هەتا دەستی‌دایە جێبەجێ کردنی ئەرکە نیشتمانی‌یەکانی کەوا لە ژیانی‌دا نیشانەیەکی دیاری بوون.

شۆڕشگێڕان، سەر دەستەیان سەرکردەی تێکۆشەر صدام حسین، دەیان زانی کە ئەرکە نیشتمانی‌یەکان زۆرن و پەلو پۆ بڵاون، وە یەکێك لەو ئەرکە گرنگانە ڕزگار کردنی نەوتی عیراقە لە چنگی داگیرکەران و شەریکە نەوتی‌یە ئاوان کەرەکان، بۆیە بەهۆی (شۆڕشی خۆماڵی کردن)ەوە دەستێکی بەهێز ی لێوەشاندن، کەوا دەرگای لە سەربەخۆیی نیشتمان و بنیات نانی دوورلە دەست تێوەردانی بێگانە خستە سەر گازی پشت.

شۆڕش باوەڕیکی تەواوی بە یەکیەتی نیشتمانی هەیەو بە یەك چاو سەیری ڕۆڵەکانی گەل دەکات لەوپەڕی ژووروەوە بۆ ئەوپەڕی باشوور، بەبێ جیایی لە نەتەوەو ئایین و ڕێبازدا شۆڕش بڕیاری دابوو ژیانێکی کامەران و هێمن بۆ ڕۆڵەکانی گەلی کوردمان دابین بکات بۆیە بە نیگایەکی بیروباوەڕو سیاسەت کارانەی دروستەوە سەیری کێشەی کوردی کردو بەڕادەیەکی ئێجگار بەرزی ڕاستی هەموو گیروگرفتەکانی

چارەسەرکردو بەرژەوەندی ڕۆڵەکانی گەلی کوردی سەربەرزمانی ڕەچاوکرد، هەر بۆیە بوو بەیاننامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ی بڵاوکردەوەو لە ١١ی ئاداری ١٩٧٤یش دا یاسای حوکمی‌زاتیی ناوچەی کوردستانی داناو دامودەزگاکانی وەك ئەنجومەنی یاسادانان و ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی دامەزراند کە لە چوارچێوەی یەکیەتیی نیشتمانی‌دا مافە ڕەواکانی گەلی کوردیان هێناوەتە دی

ڕۆڵەکانی گەلی کوردیشمان ساغیان کردەوە کەوا بەڕاستی ڕۆڵەی ئەم نیشتمانەن. ئەوە بوو لە شەڕی بەرگریی لە نیشتمان و خاکی پیرۆزی نیشتمان لە شالاوی فارسی‌دا هەڵوێستی مەردانەیان پیشان داو وەستانیان شان بە شانی ڕۆڵەکانی تری عیراق کاریکی گەورەی کردە سەر پاراستنی خاك و ئابروومان.

ئەمڕۆ عیراق لە ڕاپەڕینێکی گشتی‌دا دەژیت کە هەر لە باکوورەوە تا باشووری گرتوتەوە، بەدەیان پرۆژەی گەورە بۆ بەرزکردنەوەی پایەی نیشتمان و نواندنی ڕووی شارستانانەی عیراق جێبەجێ دەکرێن، عیراق هەنگاوی گورج و بەردەوام لە ڕێگای ئاوەدانی‌و پێشکەوتن دا هەڵ دەهێنێ‌و توانستی خۆی لە

هەموو لایەنەکانی پەرەپێدان، لە کارگەو کێڵگەو فێرگەدا دەچەسپێنی، زانیاری گەشەی کرد، ووەو زانکۆکانی وڵات بە قوتابیان گەشاو نەتەوەو هەموو ئەمانە مزگێنی دەری پاشەڕۆژێکی پڕ لە داهێنانن.

شۆڕش تووشی گەلێ مەیدان خوازی گەورە هات و لە هەمووشیان دا زۆر بەرەقی‌و بەهێز وەستاو چونکە لەسەر هەق بوو بۆیە بەسەر هەموویان دا زاڵ بوو، ئەوەبوو توانی شان و شکۆی پێنجەمین لە شکری جیهان تێك بشکێنێ‌و ئەفسانەی زۆری‌و سەنگینی ورد بکات بەڵێ ڕۆڵەکانی عیراق بەدرێژایی هەشت ساڵی ڕەبەق توانیان بەر لە درندەترین شالاوی جادوو بازانی

تاران بگرن کە لە ژێر پەردەی ئیسلامەتی‌دا هەوڵیان دا عیراق و دەوڵەتانی ناوچەکە بگرنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و ئیسلامەتی‌و شۆڕشی ئیسلامی بۆ دەرەوە بنێرن، بەڵام ئاینی ئیسلام لە کاروکردەوەی نارەوایان بە دوورەو داخ وقینی مەجووسانەشیان بستێك ڕێ‌ناکات مادام پاسەوانانی دەرکەی ڕۆژهەلات، ڕۆڵەکانی عیراقی سەربەرز بۆیان لە کەمین دا نیشتوون.

سڵاوی هەموو عیراقی‌یەك لە شۆڕش بێت. گەورەیی بۆ ناوی شەهیدانی نیشتمان.

● الهام ●



## تهنئة

■ بمناسبة اعياد تموز الخالدة .. وملاحم المجد التي سطرها مقاتلونا الابطال .. نزف احلى التهاني واسمى التبريكات للرئيس القائد المناضل صدام حسين حفظه الله ورعاه.



**شێخ علي شێخ أمين البرزنجي**
**مستشار فوج ٢٠١ دفاع وطني.**



لەچەپەوە بۆ ڕاست: علی توفیق، ڕەئیس مدحت، محمد وەرزێر، بەشیرموشیر، جمال نەبەز، کامیل ژیر، لە ساڵی ١٩٦٠/٦/٨ وەرگیراوە

# بەشیر و خەونێکی ئەرخەوانی

● پارێزەر: کامیل ژیر ●

لەگەڵ ڕێـزم دا بۆ مامـۆستـا ئەحمـەد سالار، نووسـەری (نـالیو خەونێکی ئەرخـەوانی). منیش خەونێکی ئەرخەوانیم بە مامۆستا بەشیر موشیرەوە بینی دوا بەدوای وتـارەکـەی مامـۆستـا حەمـە بۆر لە لاپەڕە (٤٦)ی ژمارە (٤)ی گۆڤاری ڕەنگینی بەڕێزدا.

لە خەوەکـەم دا وەك مامـوستـا بەشیـر لێـم زوێـر بێت وا بوو! پرسیم چی بووە؟.

وتی جا چی بێ لەوە زیـاتـر؟ ئێوە (مـەبـەستی لە بەشیرستەکان بوو) وەك قوتـابییـەکـانی سوکـرات دەرنەچوون!. سوکرات کە کۆچی دوایی کرد، قوتـابییـەکـانی وەك ئەفلاتون و گەزەنفون بەرگریان لە سوکـراتی مامـۆستـایـان کردو فەلسـەفـەکـانی ئەویـان بە خەڵکی ڕاگـەیـاند. سوکـراتی فەیلەسوف هەولـی ئەدا مرۆڤ خۆی خۆی بنـاسـێـت و لە خۆی بگـات. ئەویش وەك من یار مـەتـیـی قوتـابییـەکـانی ئەدا بۆ پەی بردن بەزانـیـن لە ڕێـگـەی خودی خۆیـانـەوە. کەچـی ئێـوە لەوە ئەچێت نەك هەر فەلسەفەکانی من بڵاو ناکەنەوە، بەڵکو بەرگریشم لێ ناکەن!.

وتم مامۆستای گەورەو بەڕێز: هەرچـەنـد ئێمـە ئەفـلاتـون و گەزەنـفـون نیـن، بەڵام ئێـوە سوکـراتن و فەرمـانتـان ڕەوایـەو ئێمەش کورتیمان نەکردوە.

وتـی ئەی ئەم نووسـەرە تازەیـەکێیە بە ناوی حەمە بۆرەوە لە دژی من ئەنـووسێت و ئێوەش لێی بێ دەنگن!؟

ئیتـر لەو بارەیـەوە، سوکـرات ئاسـایـی، لە ڕێگـەی پرسیـارو وەڵامەوە کەوتە وتووێژ:

- تۆ ئەو وتارەت خوێندوتەوە؟

+ نەخێر.

- نایناسیت؟

+ بەڵی ئەیناسم بەڵام نووسەرێکی تازە نییـە بەڵکـو کۆنـە زۆریش کۆنـە یەك تاڵ مووی ڕەش بەسەریەوە نەماوە.

- ئەی ئەگـەر کۆنـە، بۆچـی لە زەمانی خۆم دا ئەو وتارەی نەنووسی؟.

+ من وەك وتم، وتـارەکـەم نەدیوە. چی ئەڵێت؟

- بەزمانی ئاخاوتنەکەی من ئەڵێ چەوت!.

+ فەرمانی ئێوە چییە؟



( كامیل ژیر) لەگەڵ (بەشیرموشیر) لەساڵی ١٩٦٣دا

ـ با ئەو جاریّ زمانی نووسینەکەی خۆی چاك بكـات، ئەوسـا باسی زمانی ئاخاوتنی من بكات.

+ زمانەکەی ئەو چیەتی؟

ـ لە نووسینەکەیدا ئەڵێ : « فری شێخ سـەلامی بەسـەرەوە نیـیە» لە کاتێـك دا کورد ئەڵێ فری پێـوە نیـیە، نەك فری بەسەرەوە نیـیە!.

+ چیی تر؟

ـ ئەڵێ : « بە کامیرا دوو وێنەی منی لە سەر یەك کارت کێشاوە». ڕاستیـەکـەی ئەبوایـە بیـوتایە دوو وێـنـەی منی لە سەر یەك کارت گرتـووە. وێنە بە کامیرا ئەگیرێت نەك ئەکێشرێت!.

+ هەڵەکانی تری بەرامبەر ئێوە چین؟.

ـ بە کورسیـەکـەی من ئەڵێ : «کورسیەبێپاڵپشتەکەی» ئەو ئەگەر لە فەلسەفەی من بگەیشتایە گاڵتەی بەو کورسیـە بێ پاڵپشتـە نەئەکرد. ئەو نازانی کە من مەبـەستـم لە کورسی بێ پاڵپشت ئەوە بووە کە نەتـەوەکـەم بێ پاڵپشتـە!. بەدینی پێغـەمـەر ئەوەندە بێ پاڵپشتە ئەگەر بیشی سووتێنن، کەس لەسـەری هەڵ ناداتێ!!.

+ دوای ئەوە؟

ـ ئنجـا ئەڵێ : « ئەوەنـدەی پەلـە لێکـردم لە شپـرزەییدا فلیمـەکەم بیـرچـوو بیگـۆڕم، بۆیـە هەردو وێـنـەکـەم لە سەر یەك کارت و سەرەو خوار لە سەر یەکتری کێشاون».

+ وەلامی ئێوە؟

ـ ئەو نەیتـوانیبێت وێنـەیـەکی ڕێکوپێکی من بگـرێت بەلاوی، ئێـستـا چۆن ئەتـوانێت ڕەخنەیەکی ڕێکوپێك لە من بگرێت بە پیری!؟.

+ تەواو؟

ـ نەخـێـر ئەو، چاپـکـردنـی دیـوانـەکەی میصباحولدیوان ئەداتە پاڵ محمد علی کوردی !. نازانی کە محـمـد علی خۆشـی لە پاڵ من دا بوو!.

+ بەرێـز ئەگـەر ئەم جارە مامۆستا حەمـەبـۆرداوای بەڵگەی کرد بۆ لە چاپدەری ئەو دیوانە؟.

ـ من دیـوانـەکـە خۆی ئەکـەم بە بەڵگـە بزانن ناوی کـی پێـوەیـە؟ جگـە لەوەش خۆ حەمـە علی کوردی خۆی دەیان ساڵ دوای لە چاپ دانی ئەو دیـوانـە ژیـا، ئەی بۆچی قسەی نەکرد؟

+ کەواتـە مودەعی وازی هێنـاوە، شایەت دەست هەڵ ناگرێت؟

ـ بەڵێ (ئنجـا گۆڤـارەکـەی دایـە دەسـتـم و وتـی : ها تۆش بیخوێنەرەوە. . منیش خوێندمەوە).

+ مامـۆستـا گیـان : لەوە ناچێت نیـازی خراپ بێت بەرامبـەر ئێـوە ئەوەتـا ئەڵێ: « لەگـەڵ ئێـوەدا یەکتـریتـان زۆر خۆش ویستـوەو دانـیش بەوەدا ئەنـێـت کە لە چاپکـردنی نامیلکـەی هەمیشـە بەهارەکەیدا یاریدەی پارەتان داوە.

ـ اتق شر من احسنت الیە.

+ مامۆستا گیـان من ئەم قسانەی هەمـووچی‌ئـەگەیەنم. . ئێـستا حەز ئەکەم باسێکی گوزەرانی خۆتم بۆ بکەیت لە دنیای تازەتان دا.

ـ ئێـسـتـا گوزەرانم زۆر خۆشـە لێـرە. بەتـایبـەتی بەشێـك لە موریـدان، وەك محـمـد علی کوردیو أمیـن زەگی بەگ و رفیق حلمـی بەگ و حوزنـی دامـاو و گیـوی موکـریـانـیو معـروف جیـاووك و توفیـق وهـبی بەگ و توفیـق وردیو علاء الـدیـن سوجـادی و أنـور صائیب و جمال عارف و محـمـود جودت و ئەورحمان نورجان و رفیق چالاك و چەند کەسێکی تریش ، لە دەور من . . بەڵام بەخوا هەر بیرم لای نەتـەوەکـەمـە. بیـری ئێوەش زۆر ئەکەم، بەتایبەتی ئەوانەی ماون لە (حـەوتـەی مژدەبـەر) جمال و تۆ و کمـال و عیـزیو حەمـە سوجادیو وردیـەکـەش لای خۆ من نازانم کەی ئێوەش دێن زۆریش مەمنونی ئیـحـسـانـەکـەم بەراسـتـی توێـژەرەوەیەکی باشە لە فەلسەفەی من دا کە هاتن ئەویشتان بیر نەچێ.

بەڵام توخوا نەیەن هەتا مژدەی ڕزگاربوونی تەواوی نەتەوەکەم پێ ئەگەیەنن.

+ ئەوە ئاواتی هەمـوومـانـە (گەلێ پرسیـار مابـوو لێ بکەم ، کەچی لەو خەوە خۆشە خەبەرم بووەوە.).



● ونحن نعيش اعراس الذكرى العشرون لثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز الخالدة.. وتحرير اراضينا الوطنية من هيمنة احفاد كسرى ورستم .. نرفع اسمى التهاني والتبريكات لرئيسنا الهمام القائد صدام حسين حفظه الله.. والى جنوده الميامين الذين رفعوا رؤوسنا عاليا.. وعهداً منا ان نضحي بالغالي والنفيس .. لتظل راياتنا خفاقة .. تعلوا بالمجد والنصر الدائم .. وسنقاتل الأعداء من الجبل الى الهور..



**انور ميرزا**
**مستشار فوج ٢٠٩ دفاع وطني**



## تهنئة

● تهنئة حارة مقرونة بالحب والاعتزاز الى القائد الحبيب الرئيس المناضل صدام حسين « حفظه الله» بمناسبة ذكرى ثورة ١٧ ـ ٣٠ ـ تموز الخالدة .. والانتصارات الرائعة والملاحم البطولية التي سطرها جيشنا المقدام بتحرير اراضينا من براثن الاعداء الطامعين واعادتها لنا معززة مكرمة.. وبهذه المناسبة العظيمة لنوقد الشموع وننثر الورود والرياحين في الفرحة الكبيرة.. واتقدم بأسمي ونيابة عن كافة اخوانى مقاتلي فوج ٣٦ دفاع وطني باحر التهاني واحلى الاماني الى باني مجد العراق العظيم المهيب الركن صدام حسين حفظه الله ورعاه والى جنده البسلاء.



**حميد زيرو الهركى**
**مستشار فوج ٣٦ دفاع وطني**



## گوڵشەن عمر

# لەسەرتاوە هەنگاوی جوان

بەشـداری چەنـد بەرهـەمێکی هونەری پەیمانگای کردوە، لەوانە، تۆمـار کردنی کۆراڵی سلێمـانی ئاوازی هونەرمەند «صلاح رؤوف» بۆ تەلـەفـزیونی تأمیم جگـە لە بەشـداری کردنـی لەکـۆرسـی پەیمانگا بەشی مۆسیقا.

بۆ سەرەتـاو دەسـت پێکـردنی بەهـەنگـاوی جوان سەبـارەت بەهـونەرەکەی چەند پرسیارێکمان ئاراستەکرد.

**● سەبـارەت بەبـەشـداری خۆتـان لەم چالاکیـانـەدا چی‌دەڵێن ؟**

- ئافـرەت دەورێـکی گرنـگ و کاریگەری هەیە لەناوکۆمەڵدا، ئەم دەورەش لەلای هەنـدێ خێـزان نرخـی بەرزی دەدرێـتێ، لای هەنـدێکی تریش بەپێچـەوانـەوە، من رام وایـە ئەو ئافـرەتـەی بەشـداری کارێکی کۆمـەڵایـەتی، یان هونەری بکات، بەو ئارەزوەی هەیـەتـی ڕوبـەڕوی خێـزان و کۆمـەڵـەکەی بێتـەوە، تا بتوانێ لەگەڵ ئەواندا سەربەست بێت بۆ دەربـڕینی بیرە جوانەکانی بەرامبەر بەژیـان من بەش بەحـاڵـی خۆم خێـزانـەکەم کە زۆر ڕێزیان دەگرم یەکـەم هانـدەرم بوون بۆ ئەوەی لەبەشی مۆسیقا بخوێنم.

**● کە بەرهـەمێـکـی سەرکەووتو دەبینێت چی دەخوازی؟**

- زۆر خۆش حاڵ دەبـم، ئاوات دەخوازم ڕۆژ بەڕۆژ بەرهەمەکانمان سەرکەوتوتر ببینم.

**● خەریکی فێـر بـوونی چ ئامێرێکی موسیقین؟**

- ئامێری فلوت

**● جگە لە موسیقا ئارەزووی چی تردەکەن؟**

- هەندێ جار وەرزش، کاری شانۆیش.

**● بەشـداری تیپێکی تایبەتی هونەرتان نەکردوە؟**

- جگـە لە پەیمـانگـا نەخێر بۆ بەشـداربـوونیـشم لە تیپێکی هونەریدا بۆم برەخسێ شانازی پێوەدەکەم.

**● ئەی پێش پەیمانگا؟**

- ئەوەی لەیـادم ناچـێ بەرێـزی مامـۆسـتـای هونـەرمـەنـدم (ولیـەم یوحنـایـە) کە لەبـواری چالاکی قوتـابخـانەکاندا، کۆمەڵێ وانـەی بەسـوودی سەبـارەت بەموسیقا دامێ، بۆ تاقی‌کردنەوەی پەیمـانگـاو خوێنـدنی ئێستـا زۆر بەسـوودە.

**● ئازاد ●**



# گرۆز

● حسیب قەرەداخی ●

تۆ ئەزانیت من چەندێکم
خۆت ئەزانیت کە منیش چیم تۆم خۆش
دەوێ
خۆشەویستی‌ی ئازادی‌خوا بۆ ئازادی،
خۆشەویستیی شاعیری کورد بۆ خەونی
خۆش
خۆشەویستیی کۆرپەی ساوا . .
بۆ بەرمەمەو باوەش و کۆش
تۆی دەزانیت گیانم هەمووی کێڵگەی
زامە
کۆچی سووری کۆرپەی خۆمم کرد بە
چامە
بۆیە ئێستاکە گرۆزم . . بە بیانووم لە
دایکی خۆم
زەردەخەنەی دایکم نەبێ . .
کفت وکۆی دڵ بە چی بشۆم؟
ئەگەر کۆشی دایکم نەبێ
بۆ کوێم دەبەن، بۆ کوێ بڕۆم!؟
هۆ دایکی « شەم» هۆ خاکی خەم
بە دێوانە «وەلی» قەسەم . .
من ناوکێکم لە ژانی تۆ
خوێنجمانە خوێن ناگرم . .
هەتا دەبمە قوربانی تۆ .

# ئیلهام

● وصفی حسن ●

گەلــەك جاران مروڤ هزرا **خو دەکــەت و حەزد**کەت بزانیت کا شیعر ئیلهامە یان نەء ؟

**ب راستی** ئەڤ بابــەتــە ژمێــژە جهێ دویڤ چۆن **و** لێکولینێ‌یە ب هزرا من شیعر ئیلهامە بێ گومان ئەفلاتون چاخێ دکەتە بەحسێ هوزانڤانی دبێژیت « هوزانڤــان تشتــەکێ پیرۆزەو نەشێت هیچ تشتەکی بنڤیسیت هەتــا سروش یانکــو (ئیلهـــام) ژ خودێ شیعرێ بو نەهیت»

ئیلهـام هێــزەکـا نە دیـارە، ژ کویـراتیا گیانێ مروڤی دەردکـەڤیت . . نهێنیـا ئیلهامێ ئەوە دەمێ هوزانڤان دبینیت **بانگەوازیەك هات لێ** نزانیت کاژ **کیڤەهات!!**

**وەحی یانکو ئیلهام** لدیڤ **زانینا زانایێت (فرو**ێدی) **سەروکـانیـا وی** هێــزەکـا (میتافیزیکی) **یەو عەرە**ب دبێژنە ڤێ هێزێ (شەیتان)و رۆمانیاو گریکا دگوتێ خودێ شیعرێ.

ب کورتی ئەم دشێن بێــژین سروش (ئیلهـــام) ئەو هێــزە ئەوا هوزانڤـانی پالـددەت بو دانـاتـا هوزانێ‌و **نیکار**کێش پالددەت کو کەڤالەکی دروست بکەت، **ئەڤ** هێــزا پالــدەر ژ چ سەروکــانییێت غەیبی ناهێت بەلکــو سەروکـــانیـا وێ کویـراتیـا خەیـال و بینینـا **مر**وڤی‌یە، چنکو هوزانڤان یا هونەرمەند هەست ب تێنیـویـەکـا داهێنـانی (ابـداعی) دکەت . . هەست **دکـ**ەت کو تشت دگیـانێ ویـداییت هەین و دلڤلڤن وئەڤ تشتە نە تشتەکێ مادی‌یە (ملموس)ە کو بشێن بیتین یان زارڤەکەین، بەلکو بانگەوازیەکە ژ گیانێ هوزانڤانی دەردکەڤیت)[1].

لڤێرە مەدڤێت بێژین هندەك جارا چەند تشت هەنە دینە ئەگەرا ئیلهامێ بو هوزانڤانی یان هونەرمەندی **وەك** ـ ئەڤین ـ ئافرەت ـ سروشت ـ نەخوش ـ و **هنــدەك** جاران چەنـد کریـارو رویـدان. جزیـری **سەرکێشێ** هوزانـــا کوردی وەسـا خویـا دکـەت کو **ئافرەتە ئەگە**را **سروش و** ئیلهاما وی :ـ

**دێم فەنەرە خال عەنبەرە بو** ماوەرە **لەب شکەرە**
**ئەو مەی پەرست مەشهاو** مەست **جاما د دەست**
**فەرفوربو**
**مەی بەرکەڤی** مەشها صەڤی سوزا دەڤێ **دا قەرقەڤی**
**حوسنا ل دێم** وەصفان نەشێم هەر چ دبێم **ژ دور بو**
**دا من** سروش وەر مەی بنوش ذەوق **لەو**
چون هوش
ژ وێ عشوەیا یار بو خویائەو نەژمەیا ئەنگور بو [2]

ئەحــمــەد نالبـــەنــد (١٨٨٥ ـ ١٩٦٣) شاعیــرێ دەربـــەدەریێ‌و دەردو کوڤـانـا، شاعیـرێ هەمی ب سەری هاتی‌و لسەر هەمی بابەتا ئاخفتی‌و پر لسەر ئافــرەتێ ئاخفتی دکــەتــە بەحسێ خو وئـافـرەتێ‌و ئیلهامێ‌و دبێژیت:ـ

سەیرو تەماشا عامە مە
داوەت ل بەر بێ قامە مە
قەلبێ خودان ئیلهامە مە
پر توزو باگەر هاتنێ
قەلبێ مە خوش کەن ئەی **کچین**
گەش کەن دلا دل قرمچین
مامروە تە ئەم هو بچین
کەیفێ کەری **زەر هاتنێ**[3]

بێ گومان ئەڤ هەردوو هو**زانڤانە مەبەس بۆ نمونە** ئینان ئەگینا هێشتا هوزانڤانا ژ **یێت کلاسیکی‌و یێت** هەڤچــەرخ بەحسێ ئیلهـامێ **یێ کری . . . لێ‌بـو** نڤیسینەکا دی.

ژێدەر

١ ـ فەلـــەفەی جوانی‌و **هونەر. کمال** میراودەلی ـ سلێمانی ١٩٧٩ .

٢ ـ دیوانا **مەلایێ جزیری ـ تویژاندنا** صادق بهاءالدین **ئامێدی سالا ١٩٧٧** بەغدا

٣ **ـ قەفتــەك ژ هوزانێت نالبـەنـدی ـ سەعید دێرەش ـ بەغدا ١٩٨٢ .**





# شێمه قه‌ساب ته‌مه‌نی (٤٣) ساڵه‌و له شاری هه‌ولێر ده‌ژی، تاکو ئێستا (١٠٥) شووشه خوێنی به‌خشیوه‌و ئاماده‌شه خوێنی تر ببه‌خشێت

هه‌ر که ناوی شێمه قه‌ساب و چیروکی خوێن به‌خشینه‌که‌یم به‌ر گوێ که‌وت زۆر به ئاره‌زووی بینینی ئه‌م مرۆڤه له خۆبردووه بووم و چاوه‌ڕێی ئه‌و ڕۆژه‌م ده‌کرد ئه‌م مرۆڤه دلۆڤانه ببینم و چاوپێکه‌وتنێکی له‌گه‌ڵ بکه‌م، بۆیه که‌وتمه گه‌ران به‌دوای‌دا... به‌ڵام له هه‌مووی سه‌ر سوڕمانتر ئه‌وه بوو، له باره‌ی ئه‌م مرۆڤه‌وه پرسیارم له هه‌رکه‌سێك ده‌کرد یه‌که‌ر پێیان ده‌ووتم کاکه چی‌یه..؟ خوێنت پێویسته..؟!، به هه‌رحاڵ له ڕۆژی هه‌ینی ڕێکه‌وتی ١٩٨٨/٤/١ له گازینۆی (الخلود) له هه‌ولێر ئه‌م چاوپێکه‌وتنه‌م له‌گه‌ڵ کردو ئه‌ویش زۆر به‌وه دڵشاد بوو که له گۆڤارێکی کوردی هه‌مه‌ره‌نگه واته گۆڤاری (ره‌نگین)دا خۆی به هاووڵاتیان بناسێنێت...

**● خۆت به خوێنه‌ران بناسێنه...؟**

- من ناوم (محمد بلال اسماعیل)ه‌و نازناویشم (شێمه قه‌ساب)، له ساڵی ١٩٤٥ له سه‌عدوناوه‌ی هه‌ولێر چاوم به جیهان هه‌ڵێناوه‌و هه‌ر له سه‌ره‌تای ته‌مه‌نمه‌وه تاکو ئێستا قه‌سابم و له هه‌ولێر دوکانی قه‌سابیم هه‌یه‌و باوکی کوڕێك و کچێکم، کوڕه‌که‌م ناوی (فه‌هده)و پۆلی شه‌شه‌می سه‌ره‌تایی‌یه، هه‌روه‌ها کچه‌که‌شم ناوی (تانیا)یه‌و پۆلی چواره‌می ی‌ئاماده‌یی‌یه.

**● تاکو ئێستا چه‌ند شووشه خوێنت به‌خشیووه؟**

- ١٠٥ شووشه خوێنم به‌خشیووه.

**● جۆری خوێنه‌که‌ت...؟**

(+ O) (هه‌ر بۆیه‌ش ئاماده‌یی خۆم بۆ خوێن به‌خشین پیشان دا.)

**● بۆ یه‌که‌م جار خوێنت به‌کێ به‌خشی؟**

- له ڕێکه‌وتی ١٩٧٠/٥/٢٠ له کاتێکی پێویست دا یه‌که‌م شووشه خوێنم به‌خشی‌یه (نورالدین تقي الدین) که ماموستاو (ضابط ایقاع) بوو له هه‌ولێر.

**● له کاتی خوێن به‌خشین دا، هه‌ست به‌چی ده‌که‌یت؟**

- خوێن به‌خشین ئه‌رکێکی مرۆڤایه‌تی‌یه.. بۆیه له هه‌موو کاتێك زیاتر هه‌ست به به‌ختیاری ده‌که‌م، چونکه دوور نی‌یه له‌م کاته مرۆڤێك له مردن ڕزگاربێ.

**● ئه‌و یارمه‌تی دانانه‌ی که له یادت ناچێ...؟**

- زۆرن، به‌ڵا م ئه‌وه‌ی گه‌لێك سه‌رنجی راکێشاوم ئه‌مانه‌ن:-

چه‌ند منداڵێك له نه‌خۆشخانه‌ی (له دایك بوونی) هه‌ولێر هه‌ن، که نه‌خۆشی (سپڵ)یان هه‌یه‌و پێویستیان به‌خوێن دانی ماوه، ماوه هه‌یه چونکه نوژدار وتوویه‌تی: تا ته‌مه‌نیان نه‌گاته (٧) ساڵ به‌رگری عه‌مه‌لیات ناگرن، بۆیه منیش سه‌ریان لێ ده‌ده‌م و به گوێره‌ی ماوه‌ی نوژدار خوێنیان پێ ده‌به‌خشم. جگه له‌مه ڕۆژێکیان ژنێك به‌هه‌ڵه داوان خۆی به دوکانه‌که‌م دا کردو پێویستی به خوێن بوو، منیش ته‌کسیم بۆ گرت و وه‌ڕێ که‌وتمه نه‌خۆشخانه، بێگومان منداڵه‌که‌ی ژنه‌که بۆ شووشه خوێنه‌که چاوه‌ڕوان بوو، بۆیه خێرا شووشه خوێنێکم پێ به‌خشی‌و هاتمه ده‌ره‌وه، هه‌ر که هاتمه ده‌ره‌وه دیم ژنێك ده‌گریاو پێویستی به خوێنێکی خێرا هه‌بوو بۆ منداڵه‌که‌ی، منیش لێی نزیك که‌وتمه‌وه‌و گووتم: خوشکێ خۆت تێك مه‌ده، خوێنی ده‌ستی چه‌پم بۆ ئه‌و منداڵه بوو، با ده‌ستی ڕاستیشم بۆ منداڵه‌که‌ی تۆ بێت، فه‌رموو با بچین خوێنه‌که‌ی خۆت وه‌رگره.



**● جگه له پیشه‌ی خۆت ئاره‌زووی چی‌که‌ت هه‌یه؟**

- وه‌رزش به گشتی‌و تۆپی پێ به‌تایبه‌تی، چونکه خۆم له ساڵی ١٩٦٣ یاری‌زانێکی تیپی تۆپی پێی یانه‌ی (بروسك)بووم

**● به چ ڕوداوێك نیگه‌ران بووی...؟!**

به شه‌هید بوونی هاوڕێم (فه‌رهاد حیدر قه‌ساب) که ئه‌ویش خوێن به‌خشێکی به توانا بوو.. (١٣٠) شووشه خوێنی به‌خشی‌و له ساڵی (١٩٨٧) له ڕێگای سه‌ربازی شه‌هید کرا.

**● ئێستاش ئاماده‌ی بۆ خوێن به‌خشین...؟**

- بێگومان

**● دوا وته‌ت...؟!**

- (من احيا نفساً كأنما احياء الناس جميعاً) صدق الله العظيم.

**محمود خه‌سره‌و محمود**

# عبدالله زێرین



سەرەدانا ڤێ جارێ بو مالا هونەرمەندەکێ بناف و دەنگ بو ل بازێرێ دهوکێ .... ومەئەڤ هونەرمەندە هەلبژارد پشتی کو مەزانی ڤی هونەرمەندی ستودیویەکا هونەری یا ئاڤا کری لسەر کیستێ خو .. بێ گومان گەلەك قەدرێ مە هاتە گرتن .. پشتی هنگی مەژێ داخازکر بو گوڤارا رەنگین باخڤیت لسەر ژیانا وی یا پر بزاڤا هونەری.

● عبدالله زێرین کی‌یە؟

ـ عبد الله ابراهیم احمد لسالا ١٩٥٦ ل کەلا ئامێدێ هاتیمە دونیایێو ئەندامێ نیقابا هونەرمەندامە ل دهوکێو سترانبێژێ ئێزگێ کوردیو تەلەڤزیونا تەئمیم ونهو لباژێرێ دهوکێ دژیم..

● کاك عبدالله دەستپێ کرنا تە یا هونەری چەوابو؟

ل سالا ١٩٦٩ێ لئامێدێ تیپەکا موسیقی هاتە دامەزراندن لبن ناڤێ تیپا (ئێکەتیاپالا) وژبەر کو ئاوازو سترانا کوردی دگەل خوینامن تێکەل ب بون من خودا لگەل ڤێ تیپێو بڤی رەنگی من دەست هاڤێتە کارێ هونەری لگەل وێ تیپا موسیقی ولسالا ١٩٧٠ ئەز هاتمە دهوکێ ولگەل تیپا (١١ آدارێ) یاموسیقی و شانویو



## ● من ستوديەكا هونەری ب ٩ هزار دينارا لسەر كيستێ خو ئاڤاكر.

بويمە ئەندامێ ڤێتيپێ‌و چەند شانوگەريەك مە پێش كێش كرن لبن ناڤێ بزاڤا قوتابيا (نضال الطلبە )و ئوتێلا سحركەر (الفندق المسحور) و دوو شاهی (الزواجان) •

● كاك عبدالله كی‌بوێن لگەل تەلسەر دارێ شانوێی؟

- ئەز بوم ونزار بزاز ودەشتی‌شهاب و جميل زكری وزيرەك و گەلەكێت دی ژهەڤالان باش بيرامن ناهێت.

● ئێكەمين بەرهەم تە توماركری چ بوو گەنگی؟

- سترانا (شيرين دەلال) سالا ١٩٧٣ بو تيلەڤزيونا (مويسل).

● سترانێت تەژ پەيڤێت كێنە ؟

- براستی گەلەك هوزانڤان پەيڤاد دەنەمن وژوانا حافظ مائی رێكێش ئامێدی عبدالله ئامێدی.. هيڤی‌بەرواری .. كريم بدل .. محسن قوچان .. سگڤان عبدالحكيم •

● كی بوتە ئاوازا داتنيت وپتر ئاوازێت كێ بكار دئينی؟

- ئاوازێت من باراپترييێت هەڤالی هێژا (شێرزاد محمد سعيد) يەو سمير زاخولی...

● عبدالله زێرينی چەند ستران هەنە؟

- لێزگا كوردی پتر ژ (٤٠) سترانا‌و تيلەفزيونا تەئميم (١٥) ستران

● چاوا گوڤارا رەنگين دبينی؟

- براستی گوڤارەكا گەلەك ژێهاتيەو سوپاسيا هەمی بەرپسيارێت وێ دكەين كو ئەڤ گوڤارا گرنگ و تەشەنگ بو مە كورداو بو جيهانا هونەرێ كوردی دامەزراندی...

تو حەژ دەنگێ كێ دكەی ژسترانبێژا؟

- براستی ئەز حەژ هەمی دەنگێت خوش دكەم يێ‌كو پەيڤ و ئاوازێت كوردی ژدەڤی وان دەردكەڤن و بتايبەت محمد عارف جزيری



خودێ ژێ رازی وجهێ وی بەهەشت بيت.





## ● سێ تشت عبدالله زێرینی گەلەك نەڤین ؟

● عبـدالله زێـرین چەنـد ئامیرێت موسیقی لێدەت؟

- عودێ بتـنـێ

● هەڤالێت تە ژهونەرمەندا؟

- هونەرمەند هەمی هەڤالن و هەمی دیێ ڤوسیـرن بەلێ پاتحسین طەو سمیـر زاخولی وایاز من گەلـەك هەڤالینیا وان یاكری

● بو مە لســەر پروژێ ئاڤاكرنا ستودیا خو باخڤە؟

- براستی مەگەلەك نەخوشی پێتدیتین دەمێ ئەم دچـوینـە بەغـدا ئان تیلەڤـزیـونێ وهـەرجـار دا دو سێ روژا مینین هەتـاكـو مە ستـرانـەك تومـاركـربـا. . ئەڤـە گەلـەك زەحـمـەت بو . . ل ڤێـره من تەخمین كر كو ئەز ستـودیـەكێ ئاڤكـەم دابشێم پتر خزمەتا ملەتێ خو بكەم و دا رێكاوان نێزیك بیت بو هونـەری وسترانـا كوردی. . . وهوسا ئەز رابوم و لـەر كیستێ خو من دەست هاڤێتـە ئاڤـاكرنا ڤێ ستـودێی . . وهـەتـا نهـو من (٩) نەهـ هزاردینـار لێ داینـە وبێ گومـان گەلـەك پاژێ هاتیە وهەمی ئالەت وئامیرێت موسیقی ودیكورو رونـاهـی یێت لێ هەیـن ژبـلی جیهـازێـت تەسجیلێ وبـرینـا الـكتـرونی. بەس تشتێ ژێ كێم جیهـازێ كونترولێیە ئەوژی ئێزگا كوردی پەیمـانـا دایە من كو بومن پەیـدابكـەن . . وبڤی رەنگی ئەم سترانـا تومـاردكـەین وفـرێدكەینە ئێزگا كوردی.

● تەچ بەرهەمێت خو تومـار كرینە ئانەء ؟

- نە.

● بوچی؟

- هەتـا نهـو ئەزێ مژیلم بهنـدەك كێمـاسێت ستـودیڤـە بەلێ پامـە پروگـرامەك یێ تومـاركری بو ئێزگا كوردی لبـن ناڤـێ (دەنگێت نوی) وئـەڤ پروگـرامـە (دەهـ) خەلەكن هەر خەلـەك (٢٥) دەقیقـەنـە ونهو تێتە تومـاركرن لئێزگا كوردی لبەغدا.

● نەخـوشتـرین دەرفـەت دژیانا تەدا؟

- نەخـوشتـرین دەرفـەت. . دەمێ ئەز چویمـە لیـژنـا فەحصـێ و تەسـجیلێ لئێـزگـا كوردی سالا ١٩٧٣ و دەمـێ من دەسـت بسترانێ كری ژشەرمادا ئەز نەشیام بێژم

● چەند بچیك تەهەنە؟

- كرەكـەنێ و گوت سێ، دوكـوڕ وكـەچـەكـا چوان و ناڤـێت وان (ابـراهیـم/زێـریـن ) زیـن.

● تو چاوا پاشـەروژا زاروكێت خو داتنی؟

- بەری هەمی تشتـا من دەڤێت دسـەركـەفتی بن دخـانـدنـا خوداو رێكـا راستێ بگرن و كارێ باش بكەن دا دسەركەفتیبن دپاشەروژا خودا.

● تەچ هیڤی دژیانێ داهەیە؟

- هیڤیـا من ئەوە ژهـونـەرمـەندێت گەنـج كو ئەو هونـەری بخینن و شروڤـەكـەن بەری دەست پاڤێنە كارێ هونـەری دابـزانـن نوتـا موسیقی چیە وهیڤیا سەركەفتنێ بو هەمی هونەرمەندێت گەنج دكەم.

● تەچ سێ تشت گەلەك دڤێن؟

- خێزاناخو، خێر بو هەمیا/هونەری خو و یێ كوردی

● تەچ سێ تشت نەڤێن؟

- درەوو هەڤالێ بدوو روی و بەتالی.

● تە باوەری ب فالاو بورجا هەیە؟

- براستـی من باوەری پێ نینـەو فال و بورج ئەلـسـەفەكـە مروڤی قانع دكەت. بەس من باوەری پێ نە

● چیدی؟

- سوپاسیا گوڤارا هەژی (رەنگین ) دكـەم كو ئەڤ دەرفـەتە دایە مەو پتـر جەماوەر لمەشەهرەزاببیت . . جارەكـادی پر ژدل پیـروزبـاهیـا دەركەفتنا گوڤارا رەنگین دكەم وسوپاس

ئامادەو وێنەگرتن

● احسان صدیق ئامێدی ●



# فرمێسك و شیعر

هۆنراوەی فەریدون عبدول بەرزنجی ● ئاوازو گۆرانی کەریم کابان ● ئامادەو دابەشکردنی صلاح رؤوف

صلاح رؤوف
ماموستای پە یمانگای
هونەرە جوانەکانی سلیمانی




نازانم چۆن خۆشم ویستی
تائەوپەڕی خۆشەویستی
خولیای عەشقت هەمووشەوێ
فرمێسکی تازەی لێم ئەوێ

## کۆپلەی یەکەم

تۆهەوێنی شیعری تازەی
شەوانی پر ئەندێشەمی
تۆبرینی بە ئازاری
ڕۆژانی پڕلەکێشەمی

## کۆپلەی دووەم

کە هەست بە دوریتۆنەکەم
باڵداریکم بەبێ لانە
کەمن هەرگیز بە تۆنە گەم
ئیتر بۆ نابمە دیوانە

## کۆپلەی سێیەم

لە هەر کوێ بم خۆشم ئەوێ
لەهەر کوێ بی بیرت ئەکەم
ئەوجێگەیەی تۆی لێ نەبی
بۆ نی غەریبی لێ ئەکەم

تێبینی : جگـەلـە پێشـەکی‌یـە کەی‌هەرسێ کۆپـلە کەی
هەمـان ئاوازی کۆپلەی یەکەم هەیە بۆیە نەم نوسیوەتەوە

## سی ساڵ هونەری شێوەکاری



### هونەرمەند

# ئەسکەندەر عوسمان

که باسی میژووی هونەری کوردستان بوته هەوینی زور له شیوەکاری کورد و به تایبەتی له دیمەنەکانی (تابلوکانی).

هەولیر دەکریت. چەند ناویك، بمانەوی ونەمانەوی، خویان فەرز دەکەن. یەکی لەو ناوا هونەرمەندی خورسك ماموستا «ئەسکەندەر عوسمان»ە که سی ساڵ دەبیت دەست و فلچەی شەرەو بەگژی کیوی (داهینان) دادەچی، هەموو جاریکیش بەگورترو به هیوای گەورەتر تیهەڵ دەچیتەوە؛ ئەم هونەرمەندە له هەولیر له دایك بوە وئیستاش لە هەولیر دادەنیشی و رەنگە هەر لە هەولیریش بمریت. (بەهرە) له وەلامی پرسیاریك دا، دەربارەی سوود وەرگرتنی له ریبازە هونەرییەکانی جیهانی وتی: زور سوودم له ریبازە جیهانییەکان وەرگرتووە. تەنانەت هەندی تابلوم هەن لاسایی هونەرمەندەجیهانی یەکانم کردوتەوە، به تایبەتی (ڤان کوخ) لای من زور مەزنە و تابلوکان و رەنگەکانی شوینیکی تایبەتییان له دلم دا داگیرکردووە، رەنگە له داهاتوودا پیشانگەیەك بو ئەو تابلویانەم بکەمەوە.

بەلای ئەو هەموو شتیکە، هەر له منالیو قوناغی سەرەتایی قوتابخانەیەوە ئەو بەهرەیەی پەروەردە کردووە. کەلەپووری نەتەوایەتی بە شیوەیەکی سەیر تیکەڵ گوشت و خوینی بووە، دواشت؛ کاك ئەسکەندەر بەشداری له زور پیشانگادا کردووە و ئیستاش ئەندامی دەستەی بەریوەبەری کومەڵەی هەرەوەزی پیشەسازییە میللی و دەستییەکانە و بەبی دەنگیش سەرباری دیمەنە رەنگینەکانی لەگەڵ فلچە شەریانە..

● هێڤی ●





### بەسەرکردنەوەیەک

# پیشانگایەکی فولکلوری کوردی



ئەمە دووەم جارە، نوسەر عمر ابراهیم عزیز، پیشانگای تایبەتی بەبابەتە هەمەرەنگەکانی فولکلوری کوردی دەکاتەوە . . له هەر دوو ئەم پیشانگایانەدا گەلیك وردەکاری ختوتە روو. . ئەوەبوو ئەم جارەیان، سەروکایەتی زانکوی صلاح الدین پیشانگای دووەمی بو سازداو لەم پیشانگایە دا [١٤٥] بابەتی نیشان دا که سەر جەمیان بریتی بوون لەو کەل وپەلانەی له کوردەواریدا بەکار هاتوون. . .

له بەسەرکردنەوەیەکی پیشانگاکەدا که له کولیژی پەروەردەدا کرایەوە کاك عمر وتی

هەڵبەتە لەم پیشانگایەدا چەندان بەرهەمی هەمەرەنگی فولکلورم ختوتە روو، هەروەکو رەشماڵی پینج ئەستوون، له مافور، لباد، تاقمە چایە، قاوە، کوتکی ماستاو، رست، سوپەیدار، سنروقی نان، چەرخی جگەرە، بەرماڵ، کوچك، شانەیدار، پەستەك، تاسەیسەر، قاق، پەردەقانی، تەڵە، کل وکل دان، فرفروکە، هەوجار، پینج گاسن، داس، قەرانگ، فەیناغ ، حەسجەر، شەنەیئاسن، گەسك، بیر سەرەند، فەرشە، سیرەفەرشە، تیروك ، کەوڵ، هیلەك، دو گرد، لانك، باوڵ، کلاش، چرا، مەقەڵی . . . تاد.

* ئەمە چەندەم پیشانگایە؟

دووەم پیشانگای تایبە تیمە .

* جگە لەوە؟

- خەریکی لیکولینەوەی فولکلورم، لەوانەش، هەندی داب و نەریتی کوردەواری، دیاری نەوروز له پەخشانی کوردیدا، . . جگە له چەندان کوری تایبەتی له سەر فولکلوری کوردی

● شێرزاد ـ هەولێر ●

## هەواڵی سەیر لە ژیانی

# ئەلێکسەندەر دۆماسی باوک دا

● ئامادەکردنی : کریم مصطفی شارەزا ●







ئەلێکسەندەر دۆماسی باوک (١٨٠٣ - ١٨٧٠) گەورەترین و سەیرترین ڕۆمان نووسی جیهانی‌یە قەڵەمی خستبێتە شووشەی مەرەکەبەوە!! پیاوێکی گەلێ خۆرا بوو، چەندە لە دانانی ڕۆمانەکانی وریاو شارەزا بوو، ئەوەندەش لە چێشت لێنان وەستا بوو، بەڵام بە درێژایی تەمەنی نە قاوەو نە چای نەچوتە سەر لێوی و جگەرەیشی نەکێشاوەو لەسەر ئەو خۆرایی‌یەشی، گەلێ جار لەبەر خەریک بوونی بە نووسینی ڕۆمانەکانی، کاتی جەمی خواردنی لەبیرچۆتەوەو هەستی بە برسێتی نەکردووە.

لە کارە سەیرەکانی کە لە ژیانی نووسەری‌دا لێی بینراوە، ئەوە بووە کە ڕۆمانەکانی بە جۆرە مەرەکەبێک و لەسەر جۆرە کاغەزێکی دەنووسین، دەچوو وتارەکانی بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەجۆرە خامەو مەرەکەبێکی ترو لەسەر جۆرە کاغەزێکی ڕەنگ جیاوازی دیکەی دەنووسین و، بە درێژایی ژیانی ئەدەبی مەرەکەبی شینی بۆ نووسین بەکارنەهێناوە!! ڕۆژێک لە ڕۆژانیش بۆ نووسینی ڕۆمانەکانی لە ڕوخ هیچ مێزێک دانەنیشتووە بەڵکو بە پاڵدانەوەوە بەرهەمەکانی نووسیوە!

هەندێ جار وابووە دۆماس لە کاتێک دا ئیشی لە نووسینی پێنج ڕۆمان دا کردووە، تاکو داخوازیی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان جێبەجێ بکات و بەزنجیرە لەسەر لاپەرەکانیان دا بڵاوبکرێنەوەو بەوە ڕانەدەگەیشت ئەوەی دەیان نووسی بیان خوێنێتەوە، بەڵام بەوە ڕادەگەیشت بەشداریی بیست زۆران بازیی شەرەشیرو دەمانچە تێگرتن بکات !!

دۆماس کەلەپوورێکی ئەدەبیی نایاب و زۆری لە ڕۆمان و شیعرو شانۆنامەو مێژوو بۆ بەجێهێشتووین، کە سەرجەمیان د..

دەگاتە دوو

ئەوەندەی بەرهەمەکانی نووسەرە ناودارەکانی جیهانی وەکو [ گیلزور زن، برناردشۆ، ستیڤنون، ویلز، کپلینگ، ماری‌روبرتس، راینهارت، زاین گرای]. لە سەرەتادا ژیانێکی هەژارانە دەژیا، بەڵام لە دوایی‌دا بە هۆی قازانج و دەسکەوتی بەرهەمە ناودارەکانی‌یەوە، سەرجەمی دەسکەوتەکانی گەیشتۆتە ٥ ملیۆن دۆلار!!

نووسەری ناودار تا پیرتر دەبوو، هەوەس و ئارەزووی حەز لە ئافرەت کردنی لەلا زیاتر دەبوو، لەو تەمەنەدا دڵداریی لەگەڵ ئافرەتی جیا جیا کردو گەلێ کاری پر مەترسی لە پێناوی ئەو هەوەسەی‌دا کردووەو گەیشتۆتە ڕادەی شەرم و شوورەیی‌و هەموو سامانەکەی لەو ڕێگایەدا دانا، تاکو کەوتەوە سەر ژیانی هەژاریی سەردەمی زووی، لە دوا دوای ژیانی‌دا ئەوەندە هەژارو دەست کورت بوو، ئەگەر کوڕەکەی نەبوایە زۆری نەمابوو لە برسان بمرێ!

ئەلێکسەندەر دۆماسی کوڕی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: «جارێکیان باوکم لە دوا دوای ژیانی‌دا ڕۆمانە ناودارەکەی خۆی (سێ سوارچاکەکە)ی دەخوێندەوە منیش لێم پرسی باوکە چۆنت بە دڵە؟» لە وەڵام دا وتی: «خراپ نی‌یە!!» دیارە نووسەر لەبێ فیزی‌یەوە ئەم ڕایەی بەرانبەر بە بەرهەمە نایابەکەی خۆی دەربڕیوە، دەنا هەر خوێنەرێکی زیرەک و هوشیار، گەر ئەو ڕۆمانە بەرزە بخوێنێتەوە تا لە ژیان دا بمێنێ تامی خۆشی لەبن زمانی دەمێنێ. چونکە، دوای ئەو ڕۆمانە، بە هەزاران ڕۆمانی تر دەرچوون، کەچی زۆریان پێنەچوو سیس بوون و هەڵ وەرین، بەڵام ئەم شاکارەی دۆماس هەر بە نەمریی مایەوەو نەوەی نەوەکانمان بەردەوام دەیخوێننەوە!!

سەرچاوەکان

١ ـ سمير شيخانى ـ مع الخالدين بيروت ١٩٥٩
٢ ـ الموسوعة العربية الميسرة ـ القاهرة ١٩٧٢، ط ٢، ص ٢٨١

  

# شوو.. بووك... خەسوو...

**● مارەیی زۆر .. کێشەی نێوان ژن و مێرد زیاتر ئاڵۆز دەکات●**

## بووك خەسووی خۆش ئەوێت! ئەی خەسوو؟!

ئاشکرایە کە شووکردن و ژن هێنان لەکۆمەڵگای ئێمەدا زۆر شێوەی جۆراو جۆرو جیاوازی هەیە، کە هەر یەکێکیان پێویستی بەرپیورتاژێکی تایبەتی هەیە، ئەمە جگە لەوەی ئەو باسەی کە لەسەرەوە ناوم لێناوە، هەروەها پێویستی بە لێکۆڵینەوەی جیاواز هەیە، لە زۆر رووی کۆمەڵایەتی یەوە. لێرەدا، لە بەشێکی گرنگی خوێندن دا، کە پاشە رۆژێکی گەورەی وەچەی نوێو داهاتووی پێوەبەندە، ئەوانە دەبنە رابەرو مامۆستاو فێرکەری منداڵەکانمان، بە تایبەتی ئافرەتان، ئەم شوێنە خانەی پێگەیاندنی مامۆستایانی کچانە لە سلێمانی.

چەند قوتابیەك کە «شوویان کردووە»، لە بەر دەم هەندێ پرسیاردا بەیەك دەگەینەوە، حەز دەکەم شێوەی گفتوگۆ کردنەکە وەکو خۆی تۆمار کەم، تا خوێنەرو شارەزایانی دەرون، لە ئاستی بیرکردنەوەی ئەو خاتوونانەوە، تەماشای، ژیانی پاشە رۆژو گەشەسەندنی بکەن.

زۆربەی شووکردن ئەنجامەکەی خۆش ویستنە، هەندێکیش بە پێچەوانەوە، ئێمە ناتوانین بەهیچ جۆرێ سەرکەوتن بدەینە پاڵ یەکەم و سەرنەکەوتن بدەینەپاڵ دووەم، بەلای منەوە ئەگەر خۆشەویستی نەبوو، پێویستە لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا دروست بێت، هەوڵ بدرێت تێگەیشتن و دروست بوونی هاوکێشەیەکی هاوبەش نەبڕو هۆش بۆ گەشەسەندنی ژیانەکە بێتە ئەنجام، هەروەها ئەو خۆشەویستیە بمێنێ ونەمرێ. ئەمە کە لێرەدا بواری ئەوە نی یە، سەبارەت بەعیشق و شێتگیری خۆشەویستیو هەندێ بابەتی تر باس بکەین کە لەدەوری ژیانی ژن و مێردایەتیو خێزانەوە خۆی ئاڵاندوە.

■ سەرەتا قوتابی (سعاد عزیز علی) کە لەقوناغی سێهەمی پێگەیاندنی مامۆستایانە بەم شێوەیە دوا:-

شەش ساڵە شووم کردووە کورو کچێکم هەیە، کە شووم کرد ساڵی یەکەم وازم لەخوێندن هێنا. بەڵام بەهاندانی مێردەکەم کە ئەو کاتە ئەویش قوتابی بوو، پێکەوە ژیانێکی خۆشمان بردە سەر. بروام بە مارەیی نی یە، تەنها تەنگوچەڵەمەم داینگابوو، ئێستا ئەو گیروگرفتەشمان نەماوە.

لێیان پرسی:-

**● تۆ خەڵکی (بەسرای)، چەند ساڵە لەسلێمانیت، خەڵکی سلێمانی چۆن دەبینی، ئایا لێرە دەمێنیتەوە، فێری کوردی بوویت.**

- لە فێربوونی کوردی یەوە، کەمێك فێربووم، ٥ ساڵە لەسلێمانیم، خەڵکی سلێمانیم







خۆش دەوێت، ئەگەر یەکێ لەگەڵیاندا باش بێت ئەوا خۆشەویستیان بەجۆشتر دەبێت، نیازم هەیە لە سلێمانی بمێنمەوە، ئەو ماندوێتیەم بحەسێتەوە..

**خوێندن کارناکاتە سەر ڕەوتی ژیانی بەختیاری خێزان.**

**● زۆر جار لە چالاکیە هونەریەکاندا لە بۆنە نیشتمانیەکاندا دەتانبینین ئەمە کار ناکاتە سەر ژیانی ژن ومێردایەتیتان.**

- نەخێر، چونکە من خۆم پەروەردەی دەستی خێزانێکی هونەرمەندم باوکم «عزیز الکعبی» دەرهێنەرە، دایکم ئەکتەرە، مێردەکەشم یەکەم هاندەرمە، ژیانمان زۆر خۆشە.

**■ قوتابی (سوزان صابر محمد امین) پۆلی سێهەم دواقۆناغ.**

حەوت ساڵە شووی کردووە، تەنها کچێکی هەیە (سوما).

**● ئایا خوێندن کاری کردۆتە سەر ژیانی ژن ومێردیتان، یان بەپێچەوانەوە؟**

- لەبەر ئەوەی کە مێردەکەم دکتۆرە، لێرەش نیە، تا رادەیەکی کەم کاری کردە سەر خوێندنم، بەڵام بەهەوڵدان توانیمان ئەوەش نەهێڵین.

**● سەبارەت بەمارەیی زۆر چی دەڵێن؟**

- لەڕاستیدا مارەیی زۆر مەرج نیە، ئافرەت نابێت چاوی لەمارەیی بێت یان خۆی پێوە بەستێتەوە، بەڵکو هاوبەشی هەست و هۆشی لەمارەیی زۆر گەورەترە.

**● دەربارەی زۆر کردنی منداڵ چی دەڵێن؟**

- زۆر بوونی منداڵ ڕێگایەکی باشە، بەڵام ئێمە بەهۆی دووریمانەوە نەمان توانیوە، هەتا ئێستا منداڵەکەم لای باوکێتی ئەمەش بێ‌گومان ناخۆشە. ئاواتم ئەوەیە کە لە ماڵێکی خنجیلانەدا بژین، منداڵ زۆرکردنیش بەشێکی گەورەی یەزدانە بەمرۆڤی دەبەخشێ.

**● ئاواتت چیە؟**

- ئاواتمە لەگەڵ مێردەکەمدا، خوێندنی باڵا تەواو بکەم.

**■ قوتابی «گەلاوێژ محمد» قۆناغی سێهەم دوا پلەی خوێندن، لە پەیمانگا، سێ‌ساڵە شووی کردوە.**

**● ئایا هیچ جۆرە تەنگ و چەڵەمەیەك نەهاتۆتە ڕێگاتان؟**

- ئەوەی کە شایەنی باس کردن بێت نەبوە؟

**● تا ئێستا نەتۆراویت؟**

- نەخێر تا ئێستا شتیوا ڕووی نەداوە، چونکە ژن وپیاو پێویستە قسەیان یەك بێت. ئەگەر هاتوو بەژیری بەپیری ژیانەوە چوون باوەڕناکەم شتێکیوا ڕووبدات. ئەنجامەکەی تۆران و شتی لەوبابەتە دروست کات.

**● خەسووت چۆن دەبینی؟**

- بەهەموو دڵنیایەکەوە دەڵێم خەسووم دایکمەو زیاتر.

**● خانووتان هەیە؟**

- نەخێر مانگی «٦٠» دینار کری دەدەین.

**● راتان چیە سەبارەت بەزووشووکردنی، هەروەها مارەیی؟**

- ئافرەت کە گەیشتە تەمەنی خۆی شووبکات باشە، مانەوەی ئافرەت زیان دەبەخشێ، پاشان دایك و باوك کە کچ دەدەن بەشوو، ڕای کچ وەرگرن، هەوڵ بدەن ئەو پەلپوبیانوانەی کە بەکوڕ دەگیرێت، وەك ئاڵتونی زۆرو مارەیی زۆر، کە ئەمە لە هەمان کاتدا پەلپەو ڕێگا گرتنە لە شووکردنی کچەکەیان، کاتێ خۆی ئامادەبێت بۆ ئەو شووکردنە. مارەیی زۆریش: - سۆزی خۆشەویستیو لەیەك گەیشتن زۆر لەمارەیی مەزن ترە.

**خۆشەویستی پێش شووکردن مەرج نیە.**

**● دەربارەی زوربونی منداڵ دەڵێن چی؟**

- وەاللە ئەگەر یەکێ بۆی بلوێت هەتا منداڵی زۆری بێت باشە. بەمەرجێ ئەو پێویستیانەی کە

منـدالْ بوون، منـدالْی ساوا پێویستیتی زۆر بکرێت و هەرزان بێت.

● دوا ئاواتت چی‌یە؟

- هیـوادارم هەرچی ژن ومـێردە ژیانی وەکو ژیانی ئێمە بەختیار بێت.

● قوتـابی «گیـلاس کریم حسین» پۆلی سێهەم.

دوو ساڵـە شووی کردووە. پرسیـارمـان لیْکرد سـەبارەت کچ بەشوودان:-

- کچ بەشـوودان رەوایـە. لێرەدا حەز دەکـەم لای هەموو دایك و باوکی خۆشـەویست ئەو راستی‌یە ئاشـکـرابێت. ئەگـەر هاتـوو کچەکەیان کاتی شووکردنی هات، هاوسـەری خۆی هەڵبـژارد چ ڕێکـەوت یان خۆشـەویستی. ڕێگـای لەبـەردەم ئاسـان کەن، هێندەی بەتەنگە مارەیی‌یەوە دێن، ئەوەنـدە بە تەنگە دڵدانەوەی ئەو دوانەبن بۆ پاشە ڕۆژی خۆشیان.

● بووك چۆن تەماشای ماڵە خەزورانی دەکات؟

- ماڵـە خەزورانیش وەك هەمـوو ماڵێکی‌تـرو دەوروپشت تەمـاشـا دەکـرێت، ڕێـزم دەگـرن ڕێـزیان دەگرم، ئەگەر مەبەست خەسووشە بەڕاستی خەسوو خۆشەویستە.

● خانووتان هەیە یان کرێ چین؟

- خانووی خۆمانە.

● خوێنـدن کاری نەکـردۆتە سەر ژیانت؟

- لەڕاسـتیـدا کەمـێـك کاری تێکـردوم، بەڵام گرنـگە پاشـە ڕۆژە، مرۆڤ دەبێت ورەی بەرزبێت.

■ قوتـابی «نـاسـك محمد امین پۆلی دووەم، سـاڵێـك نابـێت شووی کردوە، لە ڕێـگـای خۆشـەویستیـەوە شووی کردووە.



● ژیانت چۆن دەبەیتە سەر؟

- هەست بەژیانێکی خۆش دەکەم. بەختیـارم بەرامبـەر ئاسـودەیی ئێستـای خێزانەکەم ئاواتمە بەرەو پاشە ڕۆژێکی خۆشتر هەنگاوبنێن. هیـچ جۆرە گیروگـرفـتـێکی کۆمەڵایەتیان نی‌یە.

● مارەییت چەندە؟

- ١٩ مثقال!

● ئەم مارەییە کەمەم نی‌یە.

- نەخێر، لە جێگـای خۆیدایە، نەمارەیی زۆر نەمارەیی کەم، کار ناکاتە سەر ژیانی مرۆڤ، پێویستە ئەمـڕۆ بە ئەقـڵ و ویـژدان بیربکەینەوە. بۆ پاشە ڕۆژی بەختیار.

● هیـوادارین ژیـانـێکی سەربـەسـت و پڕ لەئـارام و خۆش بینە سەر.

- سوپاس.

■ قوتـابی «ئـاورنگ جعفر عزیز» پۆلی دووەم چوار ساڵە شووی کردووە،

دەڵێت هەر چەندە مارەیەکەم زۆرە بەڵام باوەڕم بەمـارەیـی زۆری نی‌یـە، گرنـگ ئەوەیـە ژیـانێکی ئاسودەگی دەبەمەسـەر. لەماڵی جیا دائـەنیشم، ژیـانـەکـەمـان تۆزێ کاری کردۆتـە سەر خوێنـدنم. بەڵام بەهـۆی دڵـسـۆزی



مێردەکـەمـەوە، کە گشت کات هانـدەرمـە بۆ تەواو کردنـی خوێنـدنەکەم، ئەوەش بەرەوئەمان دەچێت، ئاواتم پاشە ڕۆژێکی پڕلە شانازی‌و خۆشی‌یە.

■ قوتـابی «نـەخشین صابر معروف» لە قوناغی سێهەمی پەیـمانگـادایە، ماوەی ساڵ و نیوێك دەبێت شوی کردووە؛

ئەم خوشکـە باوەڕی وایـە کە پێویستە ژیانی ژن ومێردایەتی، بەو پەڕی سۆزو لەیەکتری گەیشتنەوە ببرێتەسەر، ئاواتی گەورەی ئەوەیە ئەو ژیـانەی ئێستای خۆشتربێت، کەس و کاری مێردەکـەی خۆش دەوێت، نرخ بۆ مارەیی دانانێت، چونکـە پاشـە ڕۆژی مرۆڤی پێـوە نەبـەسـتراوە، دەڵێت مرۆڤ هەتـا بتوانێ هەوڵ بۆ خۆش گوزەرانی بدا، ئەمـەش ئاواتـی گەورەی هەموو مرۆڤێکە.

■ قوتـابی «سـارێـژ حەمـە صالح سعید» پۆلی سێهەم.

لە ماوەی خوێنـدنی پەیمانگاوە شووی کردوە، هەر وەکو هەموو دەستـە خوشکەکانی کە سـەبارەت مارەیی قـسـەیـان کرد. ئەمیش بڕوای وایـە ئەگـەر ژن ومـێرد لە یەکـتری بگـەن و ئەنـجـامـی کارەکـانیـان پێکـەوە نەخشەی بۆ دانێن، ئەوا هەرگیز مارەیی نایەتە ناوەوە. نابێت بەرێ خۆشکـەرو ناشێ بە ڕێگر، ژیانی لەگەڵ ماڵی خەزوریا بەشادی‌و خۆشی بەسەر دەبات. سەبارەت شووکردنی زوو دەڵێت مرۆڤ پێـویـستـە بیر لەو قوناغـانـە بکـاتەوە، کە پێویستە ژیـانی پیا تێپەڕێت، هەوڵ بدات ئەگـەر شوویکـرد، بێتـە مایـەی ئاسـوودەیی بۆ ژیـانـەکەی ڕێزی هاوسـەرەکـەی بگـرێت، کۆمـەڵ پێویستی بە نەوەیەکی هوشیارو بیر تیژە.

ئێـمـەش لەکـۆتـایـی ئەم چاوپێکـەوتنـەدا، بە دڵێکی فراوانەوە پیرۆزبایی لەژیانی هەموو ئەوخـوشکـانە دەکەین، هەروەها پیرۆزبـایی‌و سەرکـەوتـووی بۆ خێـزانـەکـانیـان، ئاواتـمانـە کە مامۆستایانی پاشە ڕۆژ، مۆمێکی گەش بن، لە ڕێگای پێگەیاندن و سەربەرزی وڵات دا. ئێمە تەنها ئەوەندەمان توانی بەهۆی ئازایەتی‌و سەربـەستی‌و سەربـەرزی ئەو خوشکـە دڵـسـۆزانـە بەدەست بهێـنین، ئاواتـمانـە جێگای خۆی بکـاتـەوە ڕوویـەکی گەش بخاتە سەر ژیانی مرۆڤایەتیان.

ئازاد - ئامادەی کردوە.
کاردۆ - وێنەی گرتووە.

## لەگەل مێژوونووسی بەناوبانگی کورد





# دوکتۆر کمال مظهر

لە بەشی مێژووی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدادا چاومان کەوت بە مێژوونووسی بەناوبانگی کورد دوکتۆر کمال مظهر . لە مەودای چاوپێکەوتنەکەدا چەند پرسیارێکیمان ئاراستەی کرد و ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی داینەوە.

**● مامۆستا سەرەتا دەنامەوێت قۆناغەکانی خوێندنت روون بکەیتەوە هەر لە قۆناغی سەرەتایی‌یەوە تا دوا پلەی خوێندنت.**

- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیم لە شاری سلێمانی بوو، ساڵی (١٩٥٥) بلە کۆلێژی پەروەردە وەرگیرام کە ئەوکاتە «دار المعلمین العالیە» ی پێدەگوترا. ساڵی (١٩٦٠) بۆ خوێندنی بەرز چوومە وڵاتی شوورەوی و لەوێ ساڵی (١٩٦٣) دوکتۆرا و ساڵی (١٩٦٩) دوکتۆرای (ناوك)م وەرگرت

**● لە ساڵی کەیدا دەستت کرد بە نووسین؟**

- پێم وایە ساڵی (١٩٥٦) بۆ یەکەم جار بیرم لە نووسین کردەوە، بەڵام یەکەم نووسینم چ بە کوردی و چ بە عەرەبی ساڵی (١٩٥٨) بڵاو کرایەوە.

**● لە گرنگترین بەرهەمە چاپکراوەکانت؟**

- ژمارەیەك کتێب و لێکۆڵینەوەوتارم بڵاوکردوتەوە، وەك «کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا» و «دەوری گەلی کورد لە شۆڕش بیستدا» و «تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا» و «چینی کریکاری عێراقی» و «ئافرەت لە مێژوودا» و هی تر.

**● وەکو ئاشکرایە لە ساڵەکانی حەفتادا کاری ڕۆژنامەگەریت کردووە، ئایا کاری ڕۆژنامەگەری ئەوکاتە و ئێستات چۆن دێتە بەر چاو؟**

- لە حەفتاکاندا بۆ ماوەی چەند مانگێك سەرپەشتی دەرکردنی لاپەڕەی «ڕوناکبیری کوردی» [ الثقافة الکردیة]ی ڕۆژنامەی «التأخی »م کرد. ڕۆژنامەنوسی کارێکی ئاسان نی‌یە، بەڵام لە هەموو چرخ و قوناغ و ڕۆژگارێکدا بایەخی ئەو کارە بەستراوە بە ڕادەی خزمەتی ڕاستەقینەی جەماوەرەوە، بە پێی یاسای چەسپاوی ژیانیش دەبێت لە باری لە باردا هەموو شتێك بەرەوپێش بروات.

**● جیهانی ئەدەب و نووسینی ئەو کاتە و ئێستا چۆن لێك دەدەیتەوە؟**

- زۆر بە داخەوە ئێمە و مانان مەودای تەواوی خوێندنەوەی هەموو بەرهەمەکانمان نی‌یە، چونکە زۆربەی کاتمان بە کاری زانکۆیی‌یەوە دەڕوات. بەڵام جار و بار بەرهەمی ئەوتۆ دەخوێنمەوە کە ناوەرۆك و شێوازیان زیاتر باوەڕم بەوە پتەو دەکەن کە کورد هیچی لە کەس کەمتر نی‌یە.

**● ڕات بەرامبەر گۆڤاری (ڕەنگین) چی‌یە؟**

- « ڕەنگین» بازاڕی گەرمە، وا دیارە خوێندەواران عەوداڵی ژمارەکانین، ئەوەش بۆ خۆی یەکەم نیشانەی سەرکەوتنە.

**● چۆن دەڕوانیتە ئەو لاوانەی خەریکی نووسین؟**

- یەکێکن لە هیواکانی دوارۆژ

**● دوا قسەت بۆ خویندەوارانی کورد؟**

- یەزدان بیانپارێزێت.

**● پاشان زۆر سوپاس مامۆستا**

- منیش سوپاستان دەکەم.

**● ئامانج ژاژڵەیی ●**



# پیرەمێردو جوانکاری

●عبدالقادری دەباغی●

گوارە کەوتوەتە ژێر ئەگریجەی خاو
سەراوێز وێنەی لە خوێنا گیراو

ماوەیەك لەمەوبەر برای چیرۆك نووس مامۆستا مصطفی صالح کریم ئەو شیعرەی خوێندەوەو داوای ماناکەی کرد، بیرم کردەوەو نەم توانی چ وەڵامێکی بدەمەوە، دوای چەن ڕۆژ ئەمجارە من داوام لێ کرد ئەو شیعرەیم بۆ بنووسێ، بەڵکو زیاتر بیری لێ بکەمەوەو بچمە نێو دەریای بێ لێواری جوانکاریو وردەکاری شاعیرانی کلاسیکی بەتایبەتی پیرەمێردی هەمیشە زیندوو.

بۆی نووسیم وەك نوشتەی مەلا لە باخەڵم نا، دەمەو عەسرێ لە گۆرەپانی بەردەرکی سەراوە سەردەکەوتم و، لە گێژاوی پڕ ئاژاوەی ژینی بێ سامانم دا مەلەم دەکردو دەڕۆیشتم نەم زانی شانم لە شانی گەنجێ کەوتبوو کە گوتی خاڵەگیان نەختێ وریابە، سەرم هەڵبڕیو داوای لێبوردنم کردو ڕاوەستام ڕوانیم ئافرەتێکی بەژن و باڵا بەرزی لەبار بە لەنجەو لاریکی کۆترانە دێتە خوار، جووتێ گوارەی بە ڕواڵەت ساکاری سەرنج ڕاکێشی لە گوێدایە کە بوەتە هۆی زێدە جوان کردن و ڕازندنەوەی ڕوخساری، لە دیتنی ئەو دیمەنە بە دیمەنەو ئەو وێنە گیاندارە بێ وێنەیە ڕامام و لەرەی پەرەنگی هەمە ڕەنگی گوارە تەلی دڵی دەلەراندو شیعرە پڕ ماناکەی پیرەمێردی نەمری دەختەوە یاد.

بە سەرسوڕمانەوە تەماشایەکی کردو کاتێ گەیشتە بەردەمم گوتی خاڵە ماندوو نەبی، گوتم دوای کوشتن ماندوو نەبوییم لێدەکەی؟ بزەیەکی شیرینی کردو دووسێ لاو خەریك بوون بوەستن و گوێ شل بکەن ئەویش ڕۆیشت.

لە دڵی خۆم دا وتم ڕەنگە پیرەمێردیش هەر لەم شوێنەدا شتێکی وای دیبێو ئەو شیعرە بەرزەی دانابێ خولیای ماناکەی دەستی هەڵنەدەگرت و لە مێشکم دا دەزرنگایەوە، بە چەن جۆر مانام کرد بەڵام تەنانەت خۆمی ڕازی نەدەکرد و هانی دەدام کە بە وردی چەن بارەی کەمەوەو لەدەروازەیکی دیکەوە بوی بڕوم

شەوو تەنیاییو بیکەسیو غەریبیو بەژن و باڵا جوانی کەم وێنەی ئەو پەرییە نەناسراوەو شیعرە بەرزەکەی پیرەمێرد خەویان لێ زڕاندم و ئارامیان لێ تاراندم.

وەك ڕۆحی پیرەمێرد سەرکۆنەم بکاوو لۆمەم بدات مانای شیعرەکەم بەم شێوەیە بۆ هات: کە گوارە لە کاتی خۆیدا خوێنی کردوەو لە وەختی گوێ سمینی ئەو نازدارە چەن تنۆك خوێنی لە گوێی هێناوە، جا بەو تاوانە کەوتوتە ژێر ئەگریجەی خاوو تاتای بك و زولفی بووە بە پەتی قەنارەو سەرەو نخوون لە سێدارە دراوە، جا بۆ سەرەونخونی ـ لەبەر ئەو گوارە بوتە هۆی زێدە جوان کردنیو سیحری کردوەو وەکو داستانەکەی قورئانی پیرۆز کە هارووت و مارووت سەرەو نخوون لە چاڵی بابل دا هەڵوەسراون ئەمیش وەك سلطرێك ڕەفتاری لەگەڵ کراوەو سەرەو نخوون هەڵاوەسراوە.

لێرەدا ئەو پرسیارەش دێتە پێش کە وێنەی لە خوێنا گیراوە چییە؟ پیرەمێردی دڵ تەڕی جوانی پەرەستی زانا ئەوەی لە فۆلکلۆرو داب و نەریتی ئەو سەردەمەو لە برە شوێنێکی ئێستای کوردەواری وەرگرتووە کە وەختێ یەکێ کەسێ دەکوژێ، ڕیش سپیو پیاو ماقوولان دەکەونە بەین لە جیاتی خوێنی کوژراوەکە ئافرەتێك و چەن مەڕو ماڵاتێك یا پارەو زێڕ بە

خاوەن خوێــن دەدەن کە ئیــدی تۆڵەیان لێ نەکاتەوەو دوژمنایەتیان نەکات ئەو کارە لە کوردەواری‌دا پێی دەڵێن (خوێن بەست) بەڵام ئەو ئافرەتە کە دەچێتە ماڵی برا یا کەس و کاری کوژراوەکــە بە چاوی دوژمن تەمــاشــا دەکرێ، قەدرو حورمــەتی نی‌یــەو چەشنی عەبــد مامــەڵــەی لەگــەڵ دەکــەن (وشەی [خۆ لەخوێندا نەگیراوم] لە نێو ژنانی لە ماڵە مێرد نارازی باوە.

پیرەمــێرد گوارەی تاوانبــاری کە خوێنی لە گوێی نازدار هێنــاوەو ئێستــا بە سیحری ڕوومای وەك گوڵی ڕازاندوتەوە کە وەك لە تۆڵەی ئەو چەن تنــۆکــە خوێنــەی کە ڕژانــدویەتی بە بێ دەســەڵاتیو سەرونخــونی ســەزادەدات. خۆم بەم مانایە دڵنیا کردو هاوارم کرد هەزار ڕەحــمــەت لە گۆڕی پڕ نوورت کە لە تاقــە شیــعــریکی کوردی پەتیو ساکـار ئەو گشتــە مانایەت کۆ کردۆتەوەو پێشکەشی نەتەوە داماوەکەت کردوە.

# تۆپی ڕەمەزانی ڕەواندز
## یادگاری وەستا ڕەجەب



کاتێ میــر محمــد (پــاشــای گەورە) لە ساڵی ١٢٣١ کۆچی [1] کارگــەی تۆپ دروســت کردنــی دامــەزرانــد زۆر تۆپــیــان دروست کرد بۆ بەرپەرچ دانەوەی دوژمن ئەم تۆپــانــە لەســەر دەستی وەستــا ڕەجــەب دروست کراون .

**دوای ڕوخــانی** میــرنشینی سۆران تۆپــەکــان هەریەکەیان **بۆ** شوێنێك پەراگــەنــدەکــران چەندتۆپێك لە دێــرینخــانــەی بەغداد پاراستراوەو تۆپێك لە کۆیەو لە ڕەواندزیش تۆپیــك تاکــو ئێستــا لەنــاو شار داندراوە نزیك مزگەوتی گەورە کە لە ساڵی ١٢٠٣ کۆچی [2] بەدەستی وەستا ڕەجەب دروست کراوە.

پێش ئەوەی لەناو شار دابندرێ هەر لە ساڵەکانی بیستەوە ئەم تۆپە لە گردێــك لەڕەوانــدز دانــرابــوو کەبــەســەر گەڕەکــی «زورگە» دەڕوانێت کە ئێستــا بۆتــە (فندق سیــاحــی) لە ڕەمــەزان دا بەکاردەهات بۆکاتی ڕۆژوو شکاندن.

بۆ بەکــارهێنــانی ئەم تۆپــە، دووکــەس خۆیــان ئامادە دەکرد ، تۆپچی‌یەکە تۆپەکەی ئامادە دەکردو یاریــدەدەرکــەی پەڕۆی کۆن و کاغــەزی کۆدەکــردەوەو منــداڵان یارمــەتــیــان دەدان و لە دەورەی تۆپەکە کۆدەبوونەوەوچاوەڕێی کاتی ڕۆژوو شکــانیــان دەکرد بۆ ئەوەی تۆپــەکــە بتــەقێنن خەڵکی **لەگــەڵ** دەنگی تۆپــەکــە ڕۆژووی خۆیــان دەشکــانــد. وەلــەکــۆتــایی مانگی ڕەمەزان دا دووسێ تۆپیان دەتەقاند کە نیشــانەی‌هاتنی جەژنی ڕەمەزان بوو وە لە تۆپچی‌یــە ناســراوەکــان «عبدی خواجەو مصطفی عزیز» ن وە بە کۆچ کردنی «مصطفی عزیز» **ئەم** دیاردەیە لە ڕەواندز نەما.

پەراوێزو سەرچاوە

١ - پەڕتووکی مێژووی میرانی سۆران ساڵی ١٩٦٢ ل ٤٩
٢ - لە سەر تۆپــەکــەخــۆی نووســراوە (عمل رەجەب سنە ١٢٠٣)
٣ - سوود لە چەنــد پیــاوێــکــی بە ساڵاچووی ڕەواندز وەرگیراوە

● ئومێد شێرکۆ شاکر ●



# قەبارەی ئەرز
## ۲۲ سەدە پێش ئێستا.

● د. وریاعمرامین ●

ئەسکەندەری مەزن (۳٥٦ ـ ۳۲٦ پ.ز) ساڵی ۳۳۲ پ.ز میسری داگیرکردو شاری ئەسکەندەرییەی دامەزراند کە مرد، بطلیموسی یەکەم (۳٦۷ ـ ۲۸۳ پ.ز)بووە شای میسر. بطلیموس زۆری بایەخ بە زانست و زانایان دا کتێبخانەیێکی دامەزراندورایگەیاند هەرکەسێ بۆ بازرگانێتی رووکاتە ئەسکەندەرییە دەبێ دەسنووسێك بە دیاری لەگەڵ خۆی بهێنێو پێشکەشی کتێبخانەکەی بکات، ئەگینا رێی بازرگانێتیی لەم شارەدا نادرێتێ.

ئەسکەندەرییە وەك مەلبەندێکی بازرگانیی گرنگ خەڵکێکی زۆر روویان تێدەکرد. ئەنجام ...٦٠٠/... دەسنووس کۆکرایەوە لەپاڵ ئەم کتێبخانەیە.. بطلیموس پەیمانگایێکی زانستی دامەزراندو داوای لە رۆشنبیرو زانایان کرد کاری تێدا بکەن و بخوێنن. بەم جۆرە گەورەترین زاناکانی ئەوسا روویان تێکردوبوون بە ئەندام تێیدا. ئقلیدس (۳۳۰ ـ ۲۷٥ پ.ز )کەدامەزرێنەری زانستی ئەندازەیە یەکەم بەڕێوەبەری ئەم کتێبخانە وپەیمانگایە. دوای ئقلیدس ئەراتوسثینس (۲۷٦ ـ ۱۹٥پ.ز) جێی گرت. ئەراتوسثینس زانایێکی بلیمەت و مەزنی سەردەمی خۆیبوو. ئەوەی ناوبانگی پێ دەرکرد شاکارە مەزنەکەیەتی لە دۆزینەوەی رێگایەکی ریاریی زۆر سادەو ساکار بەڵام یەکجار زیرەك بۆ دەست نیشان کردنی قەوارەو دوورییەکانی ئەرز. ئەنجامەکەی زۆر نزیك بوو لەڕاستی یەوە. ئەمە لە کاتێکا رووی‌دا کەخەڵك هەموو گاڵتە یان بەمەسەلەی خریی ئەرز دەهات

ئەو رێگەیەی ئەراتوسثینس بیست و دوو سەدە پێش ئێستا پێشکەشی مرۆڤایەتیی کرد بۆ دەست نیشان کردنی دوورییەکانی ئەرز پێویستە هەموو رۆشنبیرێك بیزانێو تێیبگات، چونکە لوونکەی زیرەکیو بیرڕوونیو بیرتیژیو زانستی تەواو و مەنتیقە.

لەنزیك شاری ئەسوانا. کە دەکەوێتە باشووری ئەسکەندەرییەو ۸۳٥/۳ کم لێی دوورە. ئەراتوسثینس بینی لە نیوەڕۆی درێژترین رۆژی ساڵ دا(۲۲ی حوزەیران) هەتاو دەکەوێتەتەوقی سەر و تیشکەکەی ستوونی دەرژێتە بنی بیرەکە. ئەشیزانیکە لە هەمان کات و رۆژی ساڵ دا گۆشەی سێبەری بورجی ئەسکەندەرییە ۷/٥ پلەیە. ئەمە سەرنجی راکێشاو کردی بە بەڵگەیێکی بەهێز (خری)ی ئەرزی پێسەلماند. بەڵگەکەش ئەمەیە.. هەبوونی سێبەر لە ئەسکەندەرییەو نەبوونی لە ئەسوانا لە هەمان کات دا بەڵگەی کەوانەیی نێوان ئەسوان و ئەسکەندەرییەیە. ئەم کەوانەیە بەشێکی خریی ئەرزە.

ئەراتوسثینس .. بەمەوە نەوەستاو ئەم دیاردەیەی بەکار هێنا بۆ پێوانی قەبارەی ئەرزو دەست نیشان کردنی دوورییەکانی ... بەم جۆرە (سەیری وێنەکە بکە.

هێلی ئەو تیشکەی ستوونی دەرژێنە بنی بیرەکەوە (أ ب)و ئەوەی لە بورجەکەوە ستوونی دادەبەزێتە سەر ئەرز (ن هـ)ی گەیاندە چەقی ئەرز (حـ). ئەمە گۆشەیێکی ۷/٥ پلەیی پێك هێنا بە گۆڕینەوە لەگەڵ گۆشەی (ج ن ی)کە گۆشەی سێبەری بورجەکەیە. دووریی نێوان (ب)و (هـ) (واتا دووریی نێوان ئەسوان و ئەسکەندەرییە) ۸۳٥/۳ کیلۆمەترە. هەر ۷/٥ پلە ۸۳٥/۳کم بەرامبەرییەتی کەواتا ۳٦۰ دەکاتە (٤۰/۰۹٥)کم کە چێوەی ئەرزە.

کەچێوە زانرا.. تیرە و قەبارەو




هەموو دوورییەکانی تر دەردەچی ئەنجامەکەی ئەراتوسثینس چەن کیلۆمەترێك زیاتر دەرچوو چونکە مەسافەی ئەو دووشوێنە بە پێی پێوانەکانی ئەوسا زۆر ورد و تەواو نەبوو.. ئەمە هەرگیز لە بلیمەتیو مەزنیو نرخی ئەم کارە کەم ناکاتەوە.

1- Doig , P.)1950) Aconcise history of Astronomy - London.
2- Haber, H. (1962) stars men and atoms New Yourk.
3- Hardy, D.A. (1978) Astronomy, London



# پیرەمێرد و حەبەزبوز

● مصطفى صالح كريم ●

کاتێــك کە لە ١٩٢٢/٧/١١ لە ئەستــەمــوولــەوە مێــژوونــووسی کورد (محمـد أمين زكى) نامـەیـەكی بە هۆی ڕۆژنـامـەی (پێشكـەوتنە)وە بۆ (مصطفى پاشای یاملكی) ـ كە لە شاری سلێمانی بوو ـ نارد، تیــایــا داوای لێ كرد كە هەولــێ بدەن بۆ گەڕانــەوەی ئەو كوردە ڕوناكبیرە ئاوارانەی بە سەر گەردانیی لە توركیـا ماونـەتەوە «ئینشائەللا لە سایەی غیـرەت حەمییـەتی ئەهلی وەطـەنەوە ئەم فەقیــرانــە لێــرە ڕزگــار دەبن و بە خزم و ئەقریبای خۆیان شاد ئەبنەوە»[1] لە نێو ئەو كەسانەدا كە ئەمین زەكی بەگ ناوی بردبوون، كوردێك بوو بە ناوی «ثابت بەگ نوری زادە».

ئەم پیـاوە (نـوری ثابت) بوو، دوای گەڕانـەوەی بۆ عیــراق لە كۆتــایــی ســاڵــی (١٩٢٢)دا بە پلەی ( مولازمی دووەم) لە سوپای عیراقی دا جێگیر كرا. لە دوای هەشت نۆ ساڵ بوو بە ڕۆژنامە نووسێكی بە ناو بانـگ، زوربـەی لێ پرسـراوان لە عیـراقا لە قەڵـەمـەكـەی دەتـرسان، لە ساڵی ١٩٣١ تا ١٩٣٨ ڕۆژنـامـەیـەكی دەر دەكـرد ناوی نابـوو [حبزبوز = حەبــەزبــووز] تا وای لێ هاتبــوو، نووری ثابت خۆشی هەر بە (حبزبوز) ناو دەبرا.

بە هۆی ئەوەوە كە نووری بە بنــەچــە خەڵـكی سلێمانی بوو، وە هەر لەوێش لە دایك بوو بوو، وە بە هۆی جیــهــانــی ڕۆژنــامــە نووسی یەوە، (پیــرەمێــرد) زۆری خۆش دەویست و ڕێــزی لە قەڵـەمـەكـەی دەگرت، هامەشۆی یەكتریان دەكرد و نامـەیـان لە نێـوانـا بوو، (پیـرەمێرد) خۆشحاڵ بوو بەوەی كە كوردێـكـی هاوڕێـی سەردەمـی غەریبی توركیـای ئێستـا لە پایتـەختـا بە نووكی قەڵـەمەكەی كورسی ژێـر گەورە پیـاوانی هێنـاوەتـە جوڵانـە. لە حوزەیـرانی (١٩٣٢)دا كە (حبـزبـوز) هێشتـا ساوا بوو، تازە پێی نابووە ساڵی دووەمی، نووری ثابت بە سەردان هات بۆ سلێمــانی، لە گەڕانــەوەیــا بۆ بەغدا (پیرەمێرد) بەم دێڕە شیعرە بەڕێی دەكات (٢):

نووری ثابت بەگ خێوی حەبەز **بز**

تەشریفی هێناو ڕۆیی خوا حافز

پیرەمێرد لە نیوەی یەكەمی دێڕە شیعرەكە دا كە دەڵێ «خێـوی حەبـەزبـز» بەدوو مانـا ئەو وشـەیەی بەكار هێناوە ، یەكەمیان (خێو) بە مانا (خاوەن) دووەمیان واتە بووە بە (خێو) خەڵكی لێی ئەترسن

* * *

لە ژمـارە (١٦٦) ی (حبـزبـوز) لە وتـارێكیا باسی گەزۆ و شاری سلێمــانی دەكــات، پیــرەمێــرد لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا (٣) بەم وتارە وەڵامی ئەداتەوە : «بۆ حەبەزبزی چاوبزی قەڵەم شاخی بزا!» « لە ژمـارە (١٦٦) دا ، (سلێمـانی) ئێمـەت بە گەزۆوە (مَـنَ الـسمــاء) یاد كردەوە ، دیــارە حەز لە گەزۆ ئەكـەی، هەر چەنـد (حـەلـەویش) نیت ، هەرچی هەی بیە، من خۆیشت و واتەیشتم خۆش ئەوێو ئەتوانم حەڵوای گەزۆت بۆ بنێم، بەڵام كەی ؟ هەر گا لە سەر كورسی نیابەت دانیشتی!»

ئەمجا (پیرە مێرد) لە نامەكەی دا بۆی دەردەخا كە ستـەمـە ئەو (كـورسی نیـابـەت) ببینێ! چونكـە پیـاوێكی خوێنـدەوارو تێگـەیشتو و خاوەن باوەڕە، جگە لەوەش ناوی خۆی بە خۆیەوەتی (سابیتە) و ناگــۆڕێ، لە بەر ئەوانــە نایكـەن **بە** (نـائیب) **لەم** ڕووەوە **هەر لەو وتارەیدا دەڵێ**:

« جا نازانـم **ئەمــەت لە سەر** نویشتـا یە یان نە، ؟ ئەگەر لە من ئەپرسی **سێ خووی** وات هەیە نایەڵێ **تۆ بە هیچ ببی**

١ ـ خوێندەواریی (عیلم)

٢ ـ خیرەدمەندیی، تێگەیشتن **(عەقڵ)**

٣ ـ ئاخ ناوت (ثــابـت)ە بە ساحێـب مەسـلەكـت ئەزانن ئەمجا هەڵبژێرە كامیان فرێ **ئەدەی»**.

لەدواییدا خاڵە حاجی خاوەنی ڕۆژنامەی (ژیان) بە هاوڕێكەی دەڵێ.

« باوكم گاڵتە ئەكەم هەر **وا بە كە هەی، ئایندە بۆ** تۆیــە، ئێستـاش بە دڵ و دەروون و **خووی خۆت** دڵشـادبـە، گەزویشت بۆ ئەنێـرم هەندێك سزاواری هەرمێ بوون، بۆم ناردن، بەڵام بۆ تۆ حەڵوا گەزۆ ئەشێ».

* * *


پەراوێزەكان

١ ـ گۆڤــاری كاروان ، ژ ، ٣٥ ، ئابی ١٩٨٥

چەپكێ نامەی مێژوو نووسێكی كورد

كمال رؤوف محمد

٢ ـ ڕۆژنامەی (ژیان ، ژ، ٣٢٧، ١٩٣٢/٦/٢٣

٣ ـ ڕۆژنامەی (ژیان) ، ژ، ٤٤١ ، ١٩٣٥/٥/١١

● بەبێ خۆ بەستەوەو بەسەربەستی بنووسن، ئەگەر دەوڵەت رازی بێ یان نا رازی

صدام حسین

# چاوی پشتەوەی جەماوەر

## شارەوانی هەولێر گوێتان لێبێ، لە هەولێر چ باسە؟!

● نامەیەکمان لەکاك هێمن حسین، دانیشتووی گەرەکی (١١) ئازار لە شاری هەولێر بۆ هاتووەو تیایدا ئەڵێ:

+ بۆ ماوەی سێ ساڵ زیاترە شەقامی گەرەکەکەمانیان بەنیوەو ناچڵ بەجێهێشتووە هەمووی بوە بەتاسەو کەنداوو کۆسپی گەورەگەورە کەلە زستان دا گۆمی گەورەی لێدروست ئەبێ !! لەم بەرو ئەوبەری شەقامی سەرەکی گەرەکەکەوە زبڵ و خۆڵ و پیسایی بوونە سەرەنۆیلك، مەڕومالآت و گاومانگاپەکی زۆر لە گەرەکەکەدا بەخێو ئەکرێن و بەهەوەسی خۆیان بەسەر شەقامەکان دا پیاسەی لێئەکەن، خەتی تەلەفۆن لەم گەرەکەدا بوەتە مەسەلەیەکی سیحری و هەرگیز دەست ناکەوێ، چی بۆ دانانی تەلەفۆنی تازەو چیبۆ گواستنەوەش.

تەنها داواشمان لە شارەوانی هەولێرو کاربەدەستانی تەلەفۆن ئەوەیە کە لایەکی رەحمەتمان لێبکەنەوەو هەر هیچ نەبێ بۆ دڵخۆشی جارجار سەرێکی ئەم گەرەکە بدەن و بەچاوی خۆیان کارەسات ببینن.

● ئیمەش لەگەڵ ئەم برادەرەداین و ئەڵێین، حەق وایە شارەوانی هەولێر وەك چارەسەریان بۆ ناکات، با سەرێکیان لێبدات و وەعدی خێریان بداتێ، کە لە داهاتوودا (دووروونزیك، قەیناکات!) چارەسەری مەسەلەکەیان ئەکەن؟ حەتما کەرەنگینیان خوێندەوە، هەر وائەکەن؟ إنشاء الله.

## مجمعی چەمچەماڵ داوای پاك و خاوێنی ئەکات!

● نامەیەکمان لە برای خوێنەر کاك شێرزاد عباس لە چەمچەماڵ بۆ هاتووە کە بە کورتی باسی خراپی و بەکەڵك نەهاتنی شەقام و کۆڵانەکانی مجمعی چەمچەماڵ ئەکات و ئەڵێ:-

+ هەرچی کۆڵان و جادەی ئەم شارۆچکەیە هەیە هەمووی تەپ وتۆزوخۆڵە، پڕیانە لە کۆسپ و تاسەو بەردوودار، هەر ماڵە لەبەردەم خۆیا جۆگایەکی کردووە بۆ ئاوی پیس دوور خستنەوە لە خۆیان، ئەم ئاوانە لەسەر شەقام و ناو کولانەکان دا کۆئەبنەوە و بوگەن ئەگرن و بوونەتە جێگاو رێگایەکی باش و ئیراحەت بۆ مێش و مەگەزو هەموو جۆرە میکرۆبێکی خراپ، کە سەرجەم هەمووی ئەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و دەردوبەلا، کەلە دواییدا چارەسەری زەحمەتە

● ئیمە والە رەنگین دا برایانی لێپرسراو لە قەزای چەمچەماڵ مان ئاگادار کردو ئیتر خۆیان و غیرەتیان ئەمرۆ رۆژی ئەوەیە کە خزمەتی ئەو خەڵکە بکەن. دلخوشیان بکەن، یارمەتیان بدەن شەقام و کۆڵانەکانیان بۆ قیرتاو بکەن، زیرابیان بو دروست بکەن، تەنگوچەڵەمەو گیروگرفتیان مەهێڵن تاکو ئیمەش و هاوڵاتیانیش مەمنونتان بین!!.

## دایەرەی ئاوی سلێمانی لە رێی خواو پێغەمبەرا چارێ!!

● کاك رزگار محمد سعید، خاوەنی ورشەی ئەلەکترۆنی دڵگیر لە گەرەکی کارێزە وشك لە سلێمانی لە نامەیەکی دا ئەڵێ:

+ زۆر لە گەرەکەکانی شاری سلێمانی (داخەکەم ناوی گەرەکەکانی نەبردووە!).

ئاوی خواردنەوەیان زۆر بە کەمی ئەگاتێ رۆژی وا هەیە، لە هەندێ گەرەك دا تەنها نیو سەعات ئاو هەیە، (جاتووخوا ئەمە خوا هەڵئەگرێ!؟) گەرەکی واش هەیە، لە ساڵێك دا جارێك نیو سەعات بێ ئاوی بەخۆیانەوە نابینن !! (عەجایەب!) هەمیشە خەریکی سەربان شتن و بەردەرگاو کۆڵان ئاوپرژێن کردن و ئوتومبێل شتن، ئەڵێی غسل و تشحیمیان داناوە.

● ئیمە دووای لێکوڵینەوەو پرسیار کردن بۆمان دەرکەوت کە ئەم برادەرە راست ئەکات، بۆیە تەنها یەك پرسیار لە دایەرەی ئاوی سلێمانی ئەکەین و، ئەڵێین (بانیکەو دوو هەوا!؟) بۆ لە گەرەکێك هەمیشە ئاو هەبێ و لە یەکێکی تریش بە تەنەکەو بە گالۆنیش دەست نەکەوێ؟ دەتوو خوا لەرێی خواو پێغەمبەرا چارێ، با ئەو خەڵکە لەم هاوینە گەرمەدا لە تونیانەخنکێ!!

## موجامەلەی کچان لە سەر حسابی کوڕان!!

● کاك پیویست احمد قادر، لە گەرەکی ڕزگاری لە سلێمانی نامەیەکی پڕ هەستی خۆشەویستی بۆ ناردووین و تیایدا، ئەڵێ:ـ

+ هەموو ڕۆژێك بۆ چوونە سەرکار لە سلێمانی‌یەوە ئەچم بۆ بازیان، بەیانیان ئەو ڕێگایە زۆر قەرەباڵغەو ئوتومبێل بەزەحمەت دەست ئەکەوێ، جار جار ئەگەر پاصێك یاخود ئوتومبێلێکی تر بێت ، ئەوا برا شۆفێرەکان تەنها لە بەردەم کچان دا ئەوەستن ئیتر خوا نەکات لایەك لە کوڕان بکەنەوە، ئەگەر کوڕێك پێش کچان سوار بێت ، ئەوا یەکسەر پێی ئەڵێن گیراوە، واتە کورسیەکانی دەورو پشتی خۆی هەمیشە گیراوون بۆ کچان، چونکە ئەو نیو سەعاتەی ڕێگا موجامەلەو قسەی خۆشی تیا ئە کرێ، ئەم موجامەلەی کچانە لە سەر حسابی کوڕانە، بەتایبەتی ئێمەو مانان کە بەیانیان زوو لە خەو هەل ئەستین بو ئەوەی لە کارەکانمان دووا نەکەوین، بەلام کچەکان ئەگەر درەنگیش بێن جێگای خۆیان بۆ گیراوە!!.

● برایانی شۆفێر ، نوزی ویژدانتان هەبێ جار جار ڕەحمێك بەو کوڕە جوان مێردە ئازاو بەکارانەش بکەن، ڕاستە موجامەلەی کچان خۆشە، بەلام ئاواش نا، کە کوڕان هەست بریندار بکەن، خۆ خۆشتان کوڕن، ڕەنگە ڕۆژی ئاواتان بێتە ڕێگا زۆر دەمێکیشە کورد وتوویەتی: ئەگەر کچ بیەوێ کوڕ بدوێنێ گۆزە هەڵدەگرێ‌و لە دوور ئاو دێنێ !! واتە ئەگەر کچان شۆخ و شەنگە بیانەوێ بتان دوێنن، ئەگەر جێگاشیان بۆ نەگرن ، هەر ئەتان دوێنن، بیانوی تر زۆرە با ئەو کوڕە باشانەش لە کارو فرمانی خۆیان دووانەکەون و ئێمەش مەمنون ئەبین.



# لە خزمەت هونەرمەندو هونەرپەرستێکدا



- کاتێ گەیشتینە بەردەرگاکەیان و دەستمان گەیشتە زەنگ و نەگەیشت مامۆستای هونەرمەند (محمد عارف) لەبەردەرگا بوو خۆیو سامانی کوڕی، فەرموو یاخودا بە خێربێن، زۆر بەگەرمی خێرهاتنی کردین. یەکەم ژوور لێوەی چوینە ناو ماڵە خنجیلانەکەیەوە، ژوری نیگار کێشان بوو، بەدیمەنی (تابلۆی)جوان جوان دارو دیواری رازابوویەوە لەولاشەوە تابلۆیەك و کۆمەڵێ فڵچەو ڕەنگ لە سوچێکدا وەك بڵێی چاوەڕێی دەست و پەنجەی هونەرمەندیان دەکردو لیان دەپرسی، کەی دێی بەسەر دەممانەوە؟ ئینجا چوینە ژوری دانیشتن، یەکەم شت بەر چاوم کەوت کتێبخانەکە بوو کە ئاخنرا بوو لە کتێبدا، لەولاوە پیانۆیەکی جوان ڕێگای خۆی کردبویەوە لەژورەکەدا. ئەوەندەی پێ نەچوو یاسمین خان بەخەندەکەی جارانییەوەو کراسێکی سوری کوردییەوە هاتە ژورەوە،(بیورن خاتوو یاسەمین خێزانی کاك محمد عارفە) هەموو پێکەوە دانیشتین و لە ئەنجامی وت و وێژەکەمان دا ئەم چەند پرسیارو وەڵامە هاتنە سەر لاپەڕەکانی ڕەنگین.

- ( محمد عارف)ی هونەرمەند، وەك هەموو دەیناسین لەنەوەی هونەرمەندە پێشەنگەکانە لە عیراقدا، ئەوانیش بەوە تاوانبار کراون کە لەسەر واقیعەت زۆر پێدادەگرن؟



















مرۆڤ و بەشداریی لە درووست کردنی جۆری ئیستاتیکاو جوانناسییان دەکات، پایەو پلەیەکی هەرە ناسک و گرنگی هەیە، بەتایبەتی لەوڵاتە پێش کەوتووەکان.

سەیرکردنێکی مووزەخانە جیهانییەکان و خوێندنەوەی مێژووی هونەریش باشترین بەڵگەیە بۆ ئەم ووشەیەمان. بەڵام کێشەی هونەرمەندی رۆژهەڵاتی و هونەرمەندی کورد بە تایبەتی ئەوەیە کە لەزەمینەیەکدا ئەو بەرهەمە ناسکەی پێش کەش دەکات کە بەداخەوە پلەی رۆشنبیریی هونەریی نزمەو کەم کەس هەیە بە چاوێکی پڕ لەرێزو خۆشەویستی سەیری ئەو بەرهەمەی بکەن بۆیەش ئەرکی هونەرمەندی کورد ئەرکێکی سەختە و کۆششی هونەریی (پراکتیکی وتیۆری) بەرەنگاریی زۆر تەنگ وچەڵمە و کەندو کۆسپ دەبێ..

**- بەرای ئێوە هونەری تەشکیلی کوردی توانیویەتی پێناسەیەکی تایبەت بۆ خۆی دروست بکات؟ ئایاتاچە ندیش هونەرمان لە دەرەوەی سنوور ناسراوە؟ بۆ زۆر لە هونەرمەندانی عیراق بەوە تاوانبار دەکرێن کە سیمای هونەری ئەورووپی بە تابلۆکانیانەوە دیارە؟**

لەگەڵ ئەوەی مێژووی هونەری شێوەکاری کوردی شتێکی تازەیە،

● تاوانباریی ئەوتۆ هەیە پیاو شەرمەزار دەکات، بەڵام ئەم جۆرە تاوانبارییەی کە باسی دەکەیت، بەراستی مرۆڤ شانازی پێوە دەکات، تا پلەی ئەوەی هەستی ئەوەم پێ دەبەخشێ، وەك بڵێی لەسەر لووتکە سەرکەشەکانی چیاکانی کوردستان وەستاوم و سەیری پەنۆرامای ئەو ژیانە دەکەم و بەرێبازێکی ریالیزمیی نەژاد وشایان و هەڵگریی ئەم ئەرکە پیرۆزە، لە ژیان و مێژوو بوونی دەوروبەر دەربیرم.رێبازی ریالیزمیش (واقیعیەت) وەك مرۆڤێکی رەسەن و خانەدانە، چەند بیدوێنی‌و لێی‌بکۆڵیەوە، ئەوەندە زیاتر گەوهەری پاك و رەوشت و خووی بەرزت بۆ ئاشکرا دەبێ و زیاتر بەدڵنیایی پشتی خۆتی پێ دەبەستی.

**- ئەرکی هونەر لەناو کۆمەڵدا بەتایبەتی هونەری تەشکیلی چۆن دەست نیشان دەکەن؟ ئەی لایەنی رۆشنبیری کۆمەڵ تا چ سنوورێك کار ئەکاتە سەر هونەر؟**

● ئەرکی هونەر لەناو کۆمەڵدا ئەرکێکی فرە مەزن و پیرۆزە، بەتایبەتی هونەری شێوەکار (تشکیلی)، چونکە ئەم هونەرە بەگشتی وهونەری نیگار کێشان بەتایبەتی، کە تاکە هونەرە مرۆڤ و سرووشت و بوون بە شێوەیەکی رەنگاورەنگ و ریالیزمی بەرجەستە دەکات وپردێکی راستەوخۆ لەگەڵ کۆمەڵدا دروست دەکات و دەبێتە بە شێك لە سامانی دەوڵەمەندیی دەروونی



بەڵام تا ڕادەیەك توانیویە پێناسەیەكی تایبەت دروست بكات، ئەم شتەش لە بارو دۆخێكی سەخت دا درووست كراوە. لەگەڵ ئەوەش تیشكی بەهرەی هونەرمەندی كورد، لەچەند حاڵەتێكدا بەشداریی لە روون كردنەوەی ئاسۆی هونەری عیراقیو عەرەبیو جیهانی كردوە. لە تاقی كردنەوەی تایبەتی خۆم لەم گۆرەپانە ناسكەدا، ئەوەم بۆ ڕوون بووەتەوە، هونەر هەرچەند لایەنی پاك و ڕەسەن و نەژادی نەتەوایەتیو كەسایەتی میللی بگرێت و بەرجەستەی بكات، زیاتر شایانی ڕێزو نرخ پێدانە چ لەلایەن گەلەوە، یاخود لەلایەن خەڵكی دەرەوەی وولاتەوە لێرەدا پێویستە ئەو ڕاستەیە باس بكەم (نەك لە هەڵوێستی پرۆپاگاندوە، بەڵكو لە هەڵوێستی باس كردنی ڕاستی یەكی بەڵگەیی)وە كە ئەو نیگارانەی درووستم كردوون و مۆرك و كەراكتەری مرۆڤی كوردو زەمینەی فۆلكلۆری كوردستانیان زیاتر هەڵگرتووە، ئەو نیگارانە زووتر جێی خۆیان لە: (مووزەخانەی ڕۆژهەلاتی ی مۆسكۆ)و ئەمریكا، فەرەنسا، بەرازیل، بلغاریا، هۆلەندەو وولاتەكانی تر كردوتەوە.

بە پێچەوانەوە ئەگەر هونەرمەند چاولێ كەریی هونەری ئەوروپیو قوتابخانە ئەبستراكت و مۆدێرنیزمەكان بكات، ئەوە جەماوەرو ڕەخنەگرو مێژوو نووسەكانی هونەریی، بەچاوێكی تر سەیری دەكەن چونكە ئەمانە بۆ خۆیان خاوەن ئەم ڕێبازو قوتابخانانەن و ئەگەر بە زەردەخەنەیەكی ئەتیكێتییەوەش پێشوازییان بكەن بەڵام لە دڵەوە دەڵێن: (ئەوانە كۆنە كا بە با دەكەن).

**- ئایا تێكۆشانی هونەریت تەنیا لە بواری پێشانگاكانتەوە بووە یاخود لە گۆرەیانی دانان و وەرگێرانیش بە شداریت كردوە؟**

من ئەگەر خەریكی نیگاركێشان نەبم، كە بەنامەو مەبەستی پیرۆزی هەموو ژیانمی دادەنێم، ئەوە خەریكی خوێندنەوەم، بەتایبەتی دەربارەی مێژووی هونەرو ژیانی هونەرمەندان و جوانناسیو ڕەخنەی هونەریی ئەوشتەی كە زۆر ڕام لێبێو چێژی تایبەتی بێ، ئەوە حەز دەكەم خوێندەوارانی بەڕێزی كوردیش بەشداریم لەگەڵ بكەن، یەكەم پەرتووكم لەم بوارە ناسكەدا، كە لەڕووسی یەوە وەرمگێراوەتە سەر زمانی خۆمان (مایكل ئەنجێلو) بوو، زۆر بە هەستێكی گەرم و گیانێكی هونەرمەندانە لە لایەن هەڵبژاردەی كوردەوارییەوە پێش وازی كرا، ئەمەش بووە هۆی بەردەوامیم و لە ساڵی ١٩٨٢ وە: (دێلاكروا، میلیە، ڕوونبس، پۆل گۆگان)، جێی خۆیان لە پەرتووكخانەی ڕوشنیرانی كورد كردوەتەوە، تەنیا پەرتووكی هونەری هێڵكاریی (فن الرسم اليدوي) نەبێ ئەو كارەساتی چاپ كردن دوای خستوە.

- من بەنیمانەوە ئەم شتە بچووكانەم كردوە، بەڵام لەو باوەڕەدام هەر ئەم هەنگاوانەش بە پشتگیریو یارمەتیو هاریكاری لەگەڵ هونەرمەندو نووسەرو مێژوونووس و ڕەخنە گرەكانی كورد، دەبێتە بەردی بناغەی ڕەخنەسازیو مێژووی هونەرو جوانناسیی خۆمان، لەدوا ڕۆژدا.

**- (ئەرنولد هاوزەر) ئەڵێت هونەر جورێكە لە بەرهەڵستی، ئێوە بەهونەرەكەتان بەرهەڵستی چی دەكەن؟**

● پێش (ئەرنولد هاوزەر) بەچەند هەزار ساڵێك، ئەدەب و هونەر جۆرێكن لەبەرهەڵستی: بەرهەڵستی مرۆڤ دژی مردن، دژی فەوتان و تاوانەوەو لە ناوچوون... فەرموو سەیری ئەدەبی ئەمری سۆمەریەكان بكە، بزانە چۆن (گلگامێش) عەودالی دۆزینەوەی نهێنی نەمریی بووەو لەم بوارە گرنگەدا چی بەسەر هاتووە... ئیتر هەر لە زەمانی هەرەدێرینەوە ئەوە كێشەی مرۆڤی ڕاستەقینەیە، ئێستاش هەر هونەرمەندو ئەدیب و ڕۆشنبیرێكی ڕەسەن بەگیانێكی هاودەم خەریكی دۆزینەوەی (دەرمانی ئەو دەردەیە).

**گۆرانە هەمیشەیییەكانی ژیان تا چەند كار ئەكەنە سەر هونەرەكەت؟**

هونەر ئاوێنەی ژیانە... بەرجەستەكردنی هەست و نەست و خۆشیو ناخۆشی گەلە.. بۆیە هەر بەسەرهات و گوڕانێكی هەمیشەیی پێویستە ڕەنگدانەوەی لە هونەردا هەبێ، بەڵام هەموو كات و زەمانێ ئەم ئەركە جێ بەجێ ناكرێ، یاخود تەنیا تا ڕادەیێ جێ بەجێ دەكرێ.. چونكە هونەری ڕاستەقینە پۆستەری مناسبات نیە، بەڵكو وەك لەدایك بوونی مندالە، پێویستی بە ماوەی سرووشتی هەیە تا لە دایك بێت، ئەمەش بێگومان بەندە بە جیهانی ناوەوەی هونەرمەندو زەمینەو بارودۆخی دەوروبەر.

**ئامادەكردنی**

**● سەرگوڵ تەیمور ●**

**وینەگرتنی غازی طلوب**



هاتنە خوارەوەی (ئەلدرین) بە پەیژەکەدا پێش ئەو (ئارمسترۆن) هاتبوە خوارەوەو، پاش ئەوی‌کامیرای تەلەفزیونی یەکەی دامەزراندبو، ئەنجا ئەم وێنەیەی هاوڕیکەی گرتبو. (ئەپولو ١١ - ١٩٦٩ - ئارمسترون، ئەلدرین و، کولینز)



بەجی هێشتنی کومەلی ئامیرو ئامیزی هەمە چەشنە بو بەکار هێنانی ئاسمانەوانی دیکەو تاقیکردنەوەی زانستی. ئاسمان رەش‌ئەچێتەوە چونکەبەرگە هەوای لی نی‌یە تاکو بەخول و تۆز بردن ئاسمان شین دەر بخات وەکو لای ئیمە.

# کورتەمێژوویەکی چوون بۆسەرمانگ

دو دەقیقە پێش نیشتنەوە لەمانگ



هەر لە سالی ١٩٥٧ وە کە (لایکا)ی سەگ بۆ ئاسمان نێردرا، تاکو ١٩٦١ کە (یوری گا گارین)ی تێدا بوو بە یەکەمین ئاسمانەوانی پیاوو، تاکو ١٩٦٣ کە (ڤالنتینە تێریشکوڤە)ی تێدا بو وبە یەکەمین ئافرەتی ئاسمانەوان و، تاکو ١٩٦٩ کە (نیل ئارمسترون) پێی نایە سەر مانگ و، تا ئیمرۆ (١٢/٦/٨٨ رۆژی نووسینی ئەم بەرهەمە.) کە پێنج کەس (چوار سوڤیەتی‌و بولغاری‌یەك) لە کەشتی (میر)دا لە ئاسمان خەریکی تاقیکردنەوەو سوورانەوەن، سەدەها پلەی پێشکەوتن لە بارەی زانستی ئاسمان ناسینەوە دەستگیری ئادەمیزاد بووە.

وتاری ئەم جارەمان و، وێنەکانی بریتین لەو پلەو هەولانەی یەکەمین ئادەمیزادیان گەیاندە سەر مانگ.

ناوی ئاسمانەوانەکان و، کەشتی ئاسمانی‌یەکانیان و، رۆژی چوونیان بۆ ئاسمان



٩ - ئینوس (مەیمونی شیمپانزی) میرکیور، ٢، له



٨ - هێرمان تیتۆف ڤوستۆك ٢ له (١٩٦١/٨/٦) دا



٧ - یوری گاگارین (یەکەمین ئاسمانەوان) ڤوستۆك ١ له



٦ - ژلیزدوچکە (سەگ) سپەیس شب ٥ له (١٩٦١/٥/٢٥)دا



٥ - چێرنوشکە (سەگ) سپەیس شب ٤ له (١٩٦١/٣/٩)دا



١٩ - بۆریس یاگۆرۆف، ڤۆسخود ١، له



١٨ - ڤلادیمیر کوماروڤ ڤۆسخود ١ له (١٩٦٤/١٠/١٢)دا



١٧ - ڤالینتینا تیریشکۆڤا (یەکەمین ئاسمانەوانی ئافرەت)



١٦ - ڤالێری بایکۆڤسکی، ڤۆستۆك ٥، له (١٩٦٣/٦/١٤)



١٥ - گۆردن کوپەر، فەیث ٧ له (١٩٦٣/٥/١٥)دا



٢٦ - جەیمس لوڤێل، جەمینی ٧، له (١٩٦٥/١٢/٤)دا



٢٥ - چارلس کونراد، جەمینی ٥، له (١٩٦٥/٨/٢١)دا



٢٤ - ئێدوارد وایت، جەمینی ٤ له (١٩٦٥/٦/٣)دا



٢٣ - جەیمس مکدیڤیت، جەمینی ٤، له (١٩٦٥/٦/٣)دا



٣٥ - ئێدوین ئەلدرین، جەمینی ١٢ له (١٩٦٦/١١/١١)دا



٣٤ - ریچارد گۆردن، جەمینی ١١ له (١٩٦٦/٩/١٢)دا



٣٣ - مایکل کۆلینز، جەمینی ١٠ له (١٩٦٦/٧/١٨) دا



٣٢ - یوجین شێرنان، جەمینی ٩ له (١٩٦٦/٦/٣)دا



٣١ - دەیڤید سکۆت، جەمینی



٤٥ - رەسل شویکارت، ئەپۆلۆ ٩، له (١٩٦٩/٣/٣)دا



٤٤ - ئەلیکسی یەلیسێیڤ، سۆیوز ٥، له (١٩٦٩/١/١٥)دا



٤٣ - یەڤگینی خرونۆڤ، سۆیوز ٥، له (١٩٦٩/١/١٥)دا



٤٢ - بۆریس ڤۆلینۆڤ سۆیوز ٥ له (١٩٦٩/١/١٥)دا



٤١ - ڤلادیمیر شەتالۆڤ، سۆیوز



١ ـ لایك (سەگ) ـ سپوتنك ٢ له (١٩٥٧/١١/٣) دا



٢ ـ بیلکە (سەگ) ـ سپەیس شب ٢ له (١٩٦٠/٨/١٩)دا



٣ ـ ستریلکە (سەگ) ـ سپەیس شب ٢ له (١٩٦٠/٨/١٩) دا



٤ ـ (شێلکا)و (موشکا) موسەگ، سپەیس شب ٣ له (١٩٦٠/١٢/١)دا



١٠ ـ جون گلین، فرێندشب ٧ له (١٩٦٢/٢/٢٠) دا



١١ ـ سکوت کارپینتەر، ئورورا ٧، له (١٩٦٢/٥/٢٤)دا



١٢ ـ ئەندریەن نیکولایێف، ڤوستوك ٣ له



١٣ ـ پاڤل پوپوڤیچ، ڤوستوك ٤، له (١٩٦٢/٨/١٢)دا



١٤ ـ والتەر شیرا، سیگما ٧، له (١٩٦٢/١٠/٣)دا



٢٠ ـ کونستانتین فیوکتیستوف ڤوسخودا له (١٩٦٤/١٠/١٢)دا



٢١ ـ (پاڤیل بیلاییف)و (ئەلیکسی لیونوف) ڤوسخود ٢ له (١٩٦٥/٣/١٨)دا



٢٢ ـ (ڤیرجیل گریزن) و (جون یونگ) جیمینی ٣، له (١٩٦٥/٣/٢٣)دا



٢٧ ـ فرانك بورمەن، جیمینی ٧ له (١٩٦٥/١٢/٤)دا



٢٨ ـ توماس ستافورد، جیمینی ٦، له (١٩٦٥/١٢/١٥)دا



٢٩ ـ (ڤیتیرۆك) و (ئوگولیوك) سەگەکان. کۆسمۆس ١١ له (١٩٦٦/٢/٢٢) دا



٣٠ ـ نیل ئارمسترۆنگ، جیمینی ٨، له (١٩٦٦/٣/١٦)دا



٣٦ ـ کیسەڵەکان (سورتل) زۆند، له (١٩٦٨/٩/١٥)دا



٣٧ ـ دون ئیسێل، ئەپۆلۆ ٧ ، له (١٩٦٨/١٠/١١)دا



٣٨ ـ والتەر کەنیتام، ئەپۆلۆ ٧. له (١٩٦٨/١٠/١١) دا



٣٩ ـ جورجی بیرێگوڤوی، سویوز ٣ له (١٩٦٨/١٠/٢٦)دا



٤٠ ـ ولیەم ئەندەرز، ئەپۆلۆ ٨، له (١٩٦٨/١٢/٢١)دا



ئەم وێنــە دڵگیـرە زەوی لە لایـەن تاقمی ئەپۆڵۆ (١١) وە گیرا لە کاتێکا مانگیـان بەجێ هێشتبوو، ئەگەڕانەوە دەریـاری سپی ناوەڕاست و زوربــەی وڵاتانی ناوچەکە بە ئاشکرا دیارن..




خواردنەکانیان ، وشك نەکرینەوە. بۆ پاراستــنیـان و کەم کردنــەوەی قورسایی ئەمە وێنەی نموونەیەکیانەو، بریتی‌یە لە گۆشتی مریشك و سەوزە ئاوی گەرمی تێکەڵ دەکرێت و، پاش ماوەی ٥ ـ ١٠ دەقیقــە ئاسمــانــەوان ئەیگـوشێتـە ناو دەمی‌یـەوە (چونکە نە خۆی نە خواردنـەکـەی قورسـای‌یـان نی‌یــە). بۆ ئەوەی ناو کەپــسولــە (کــەشتی‌یــە ئاسمــانی) ـە کەیـان پڕ نەبـێـت لە وردە شت و، ماوەی خواردنـە کانیـان ئەو (حـەپە)ی لە ناو کیسـەکـەدایـە هەمویان کۆ ئەکاتەوەو، تویەڵیان ئەکات لە دەوری خۆی.

سەرچاوەی گشت وێنەکان چەند ژمارەییکی گۆڤاری سەندەی تایمسی هەفتانەی لەندەن.

**وەرگێران و ئامادەکردنی**
**● انوز محمد قرەداغی ●**

# ساباتەکەی خاڵە رەجەب



رەجەب

● ئەڵێن بەهەشت لە ژێر پێی دایکانـدایە، ئایا خەسوی رەجەبیش ئەگرێتەوە؟

پەخشان محمود شارەزوور

■ خەسوی من لە ژێر زمانیایەتی!

● ئەڵێن زاوا کەری خەزوورە، ئەی رەجەب چی خەزوریەتی ؟

کریم غفور - هەولێر

■ سۆپەری خەزوریەتی،

● چی دەکەیت، ئەگەر کچێکت خۆش ویست زۆر لە خۆت درێژتر بوو ؟

زوهریە شیروانی - هەولێر

■ خوا کەریمە !!.

● ئەگەر ژنەکەی خاڵە رەجەب ، لەگەڵ خاڵەدا خراپ بوو، چی دەکات؟

أرسلان شێخۆ - سیدەکان

■ جل و قاپ شتن و گسك دان. .

● خاڵە رەجەب بۆ ئەوەندە رووت گرژە؟.

رمزی کاکۆ - ئالتون کۆپری

■ لە خەسوم بپرسە؟

● خاڵە رەجەب، بیستوومانە بە منالی خۆشەویستیت کردووە؟

جلیل حمد - شەقلاوە

■ چونکە ئەوەی بەگەورەیی فێری خواردن ببێ دەست بۆ لوتی ئەبات!

● ئایا ماڵی خاڵە رەجەب هێشتا لە گەرەکی قۆریەیە؟.

صابر مجید - سلێمانی

■ ئێستا لە پیاڵەین؟

● رەجەب بۆچ کچان حەز لە سۆپەرە

قینیان لە لاداو لاندگرۆزەرە

نوزاد فائق - کرکوك

■ چونکە جوانان تەماعیان زۆرە ئیتر ناپرسن سورەیان بۆرە

● ئەگەر خێزانت لای دەرگای لێ گرتی چی ئەکەیت؟!

مظفر محمد - پیرزین

■ ئیستاعیدی بۆ ئەکەم!!

● ئایا راستە خاڵە رەجەب زۆر تورە دەبێ؟

بکر عبد الرحمن - کرکوك

■ تەنها لە دڵی خۆم دا!

● ئەڵێن رەجەب کە لەشێرێکی هەیە رۆژی سێ هێلکە ئەکات؟

حمد محمد شارەزووری

■ کەڵەشێری ئێمە هەر یەك هێلکە ئەکات!!

● ئایا خاڵە رەجەب حەز لە کچی قژ زەرد یاخود قژ رەش ئەکات ؟

گەلاوێژ محمد - کرکوك

■ هەر قژی بەسەرەوەبێ ئیتر قەیناکات!

● ئەگەر ژنەی رەجەب مرد، رەجەب چی ئەکات؟

ناصح عثمان - هولێر

■ تۆبا، بمرێ خوا کەریمە!

● ئەچم بۆ حەج چی بۆ خاڵە رەجەب بهێنم؟

عبدالکریم نصراللە - سلێمانی

■ ئاوی زەم زەم!!

● ناڵێنی بولبول بۆ گوڵە ، ئەی ناڵینی من بۆ چی یە؟

یونس محسن - شەقلاوە

■ خوا ئەزانێ!.

● ئەگەر سەعاتەکەتان خەوتبوو، بەیانیان چی ئەکەیت؟.

فلاح فائق - کرکوك

■ قورت بەسەر، ماڵەوەمان هەمیشە بەخەبەرە!!

● ئایا رە جەب دەمووچاوی لە پێشەوەیە؟.

ئاری خدر - سلێمانی

● لە تەنیشتەوەیە!.

● رەجەب گیان بۆ نایەیت بۆ هەولێر کچە مامێکی جوانم هەیە پێشکەشتی بکەم؟.

عیسی فیصل - هەولێر

■ ماڵتان نازانم ، ئارامی گیانم بنێرە ناونیشان لاتان میوانم





# ژانێکی بەختەوەر..!!



* پیش هەمــوو شتێــك، کە لەم دەزگـایـەدا، [ چاودێری کردنی بەسـالاّچـوان] ئەچێتە ژوورەوە، هەسـت بەبــەختــەوەری بێ کۆتـایی دەکــەی، کە چۆن مرۆڤ، سەربـاری ئەو تەمـەنە درێژە هەست بەو بەختــەوەرییــە دەکــات و چ نهێنییـەکـە کە مرۆڤ دوای تەمــەنــی ۹۰ ساڵی لە گەنجێك بچێت؟!. جاران، بەساڵاچوان، کە کەسیان نەبــوو، یادەســت کورت بوون، لەســەرشــەقــام دەکــەوتن، یان ڕوویــان لە سواڵکــردن دەکرد، ئەمڕۆ دەزگایەکی خاوێن هەیە کە هەمــوو مەرجێکی حەســانــەوەی تێــدایـەو بەسـالاّچـوان لەباوەش دەگرێت و نازیان هەڵدەگرێت.

## بۆچی دامەزرا؟!

ئەم دەزگایە، یەکێکە لەو دەزگا خزمەتگوزاریانە کە سەربەئەمانەتی گشتیی کۆمـەڵایەتییە، لە هەموو کوردستاندا تەنیا لە هەولێر هەیە، مەبــەســت لە دامــەزرانــدنــی، ڕزگـارکـردنی بەساڵاچوو یان پەكـ کەوتـەکـانە، کە لەم دەزگایەدا ئەو بارودۆخەیان بۆ دروست دەکرێ، کە هەســت بەکــەم وکــورتــیو ناتـەواوی خۆیـان نەکەن، یان بێ هیــوا نەبــن لە ژیــان.. لەم دەزگـایـەدا هۆی دیاری حەسانەوە هەیــە کە بریـتییــە لە شوێـنـی نووستن و دابین کردنی خواردن و جل وبــەرگ و هۆی کات بەسەربردن و خزمەتگوزاری کە لە بەشـەکـانیدا بەشێوەیەکی بەردەوام پێشکەش دەکرێن.



## بەشەکانی دەزگاکە.

بەڕێــز خســرۆ سمــایــل بەڕێــوەبــەری چاودێــری‌کـردنی بەسـالاّچـوان وتی: لەم دەزگـایەدا چەنــدان بەشــی دیــار هەیــە کە هەریــەك لەوبــەشــانــە ئەرکــی خزمەتگوزاری خۆی هەیە،

١ - بەشی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی.

٢ - بەشی دوورین.

٢ - بەشی سەر تاشین.

٤ - نەخۆشخانە.

## لەبەشی لێکۆڵینەوەدا.

خاتــوو سمیحــە کە دەرچــووی بەشی کۆمـەڵایەتییە لێپــر سراوی ئەم بەشەیە ئەڵێ:

جاران، واهەستم دەکرد کە مامەڵە لەگـەڵ ئەم بەسـاڵاچـوانـە گەلێك گیــروگــرفتی تێـدایـە، بەڵام پاش ماوەیــەك لە کارکــردنــی ڕۆژانــە لەگـەڵیـانـدا، گەیشتمـە ئەوەی کە

**دەزگای بەساڵاچوان دەزگای حەسانەوەو ئارام گرتن.**

بەپێچـەوانـەوە، چونکـە هەریـەك لەمــانـە چیرۆکی خۆی هەیـە.. ئێمـە لەم بەشـەدا، بەشێـوەیە کی ڕۆژانــە باری ژیــانـیــان بەسـەردەکـەینـەوە، بەتایبەتی باری دەروونیـان، تاکـو بتوانین جێگەی کەس وکــاریــان بگــریــنــەوە وئەونازەیان بدەینێ کە پێویستە لەم تەمـەنـەدا بدرێ بەمرۆڤ بۆئەوەی هەسـت بەئــارام گرتن و دڵنیــایی خۆی بکات.







## نه خۆشخانەیەکی بچووك..

لەم بەشـەدا، خاتـوو ناهـدة خضر وتی: بەشێـوەیـەکی ڕۆژانـە باری تەندروستی تـەواویان بەسەردەکەینەوە، هەروەکـو خۆشتـان دەزانـن کە مرۆڤ لەم تەمەنە پێویستی تەواوی بەچاودێری کردن هەیە.

## یانەیەکی دڵگیر..

کە لە بەشەکاندا گەڕاین، لە هۆڵی خواردن، بەسـاڵاچـووە ئێسـك سووکـەکـان خەریـکـی ژەمـی نیـوەڕۆبـوون، بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە بێدەنـگـیو ڕێـك و پێـکـی سیـمـایـەکی جوانـی دابـوو بە دیمـەنـە کە. پاشـان چووینـە یانـەکـەیان، کە تەلـەفزیـۆن و کتێبخـانـەی خنجیـلانـەی تێدایـە وکـاتی پێبەسـەر دەبەن، جگە لە ئێستگـەیـەکی ناوخۆیی کە بەپێی پرۆگرام بڵاو دەکرێتەوە.

## بەساڵاچوان، گەشت ڕێك دەخەن..

لە هەمـووی جوانـتـر، لەم دەزگـایـەدا، بەرنـامـەیەکی تایبەتی هەیـە بۆ گەشـت و گەشت گوزاری، بەتـایبـەتی بۆ هاوینە هەوارەکان کە کاتی خۆیانی تێـدا بەسـەردەبـەن.. لەم گەشتانەشا، کارگێڕانی ئەم دەزگایە بەشدارن..

## خێزانێکی بەختەوەر

کە لە گەڵیاندا دەدوێی، هەست بەوەدەکـەیت کە ئەمـانـە چەنـد بەختەوەرن... تەنیا لەوە بترازێ کە خۆشـەویستی کەس و کاریـان نی‌یـە.. هەست بە بەختـەوەری دەکـەیـت کە بەیـەکـتـرییـان دەبەستێنەوە، ئەمەش زیاتر لە وەدا دەردەکـەوێ کە هەمـیشـە ڕوو بەزەردەخـەنەن و، وا دیارە ستەمی ڕۆژگار نەیتوانیوە پێکەنین و بزە لە ڕوویانا بکوژێنتەوە!.

## ئەی خۆیان چی دەڵێن؟

لەناویاندا گەڕاین، هەر هەموویان خۆشخاڵ بوون، ستایشی ئەوەیان دەکـرد کە چۆن لە دەست شەقام ڕزگـاربـوون... حەلاو حەمە صالح تەمەنی [ ٧٠] ساڵە دەڵێ = لە سەر شەقام کەوتبووم، لێرە نوێ بوومـەوە، تێربووم، جل و بەرگی پۆشتـەم لەبـەرە عەیـشـێ کاك عبـدالـرحمن [٨٢] ساڵ دەڵێ = خوایـە مەمنـون کە کەوتمـە ئێـرەو ئێـستـا لە هیچم کەم نی‌یـە.. نووستن و خواردنی چاك.

## چیرۆکی «گوڵێ»..

گوڵێ، ئەو ناز ناوە شیـرینـەیـە کە دراوە بەئـافـرەتێکی بە ساڵاچـوو، هەر هەموو ئەندامانی ئەم خێزانە، ناویـان لێنـاوە[ گوڵێ] چونکە کە هات ناوی خۆی نەدەزانی، ئێستا گوڵـێ، هەسـت بەبـوونـی خۆی دەکاو زەردەخەنە لە ڕوویدا دەبارێ.

## لە ٩٠ ساڵ پتر!

خاڵۆ حسین ابراهیم تەمەنی لە ٩٠ ساڵ پتـرەو لە ١٩٨٢ لەم دەزگـایـە دەژی. دەڵـێ: سواڵکـردن شوورەیی‌یە، بۆچی بە ساڵا چوان نایـەنـە ئێرە کە هەموو شتی تێـدایـەو هەمـوو پێـویستمان دابین کراوە.

مایـەوە سەر ئەوەی بڵێـیـن، نابێ هەوڵ و کۆششی بەڕێوەبەری دەزگـاکـە لە بیـربکـرێ کە هەر هەمـوو ئەنـدامـانی خێزانـەکـە خۆشـیـان دەوێو، ئەویش لە نزیکەوە گوێ‌لە خەمیان دەگرێت.

## تەنیا داخوازییەك

ئەم دەزگـایـە، تەنـیـا هی بەساڵاچوانە، کە چی زۆر حاڵەتی وا هەیـە کە مرۆڤ شێـت و کەروڵاڵ و شتی‌تـری بۆ دێنێ کە ئەمـە لەگـەڵ یاسـای ناوخـۆیی دەزگاکە ناگونجێ، جگە لەوەی کە کار لە باری دەروونـی ئەوانـی تریش دەکات..!.

## بەبەختەوەری...

ئەوەی سەر لەم دەزگایە بدات هەسـت بە بەخـتـەوەری تەواو دەکـات، چونـکـە بینـینـی زەردەخـەنـەی گەش لە ڕوویـاندا مانای گەش بینی‌یە بەرامبەر بەژیان.

● شێرزاد عبدالرحمن ●


نورسین


شعبان سلیمان


ادیب حسین


شمال اسماعیل

# تیپا شورەشڤان ٥٥
# ئـەمیکلا بئەزمان کر

ژ ١٠ - ١٩٨٨/٣/١٦ بێ دەنگی و لالیا باژێرێ یونانی (ئەمیکلا) کەفتە دناڤ چار چوڤێ بزاڤێت تیپا شانـووا شورەسڤـان دا. ل هولا (مـتـدی المـسـرح) ل بەغـداو بهـاریکاریا دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤ کرنـا کوردی هاتـە پێش کێش کرن. ئەڤ شانـوگـەریـە ژ نڤیسینا (نـزار سلیم)و وەرگێـرانـا ماموستایێ تورەڤان (رشید فندی)و دەرهێنـانـا هەڤال (فهمی سلیمان) بو. پشکـداریت ڤی کاری چەنـد هەول و بزاڤ و رەنج کێشا دا وێ ترسـێ خویـا کەن ئەوا خەلـکـێ ئەمیکلا بێ ئەزمان کری، دا وێ پلا نە تێ‌گەهشتنێ دیار کەن ئەوا مللەتـێ ئەمیکـلا کورە کرین یان ژی دا وی تێیا ی (کابوس - ی) بینە بەرچاڤ ئەوێ مروڤ بێ زار کری.

نڤیسـەرێ خودێ ژێ رازی (نـزار سلیم) ب زیرەکی‌و پەهلەوانی

چەڤـەنگـەك بو زوربـەی خەلکێ جیهـانی، روژەك بو.کەوکـەبـا جیهانەکە بەرزە و نە دیار، ستێرەك بو ئەسمانەکێ ب ئەور و پر مژ و موران. پەلاتینکەك بو فەنەرەکێ ڤەمری.

هەر وەسـا نڤیـسـەری سێ تەخێت زور گرنگ و ب هێز یێت هەلـبـژارتین بو دەربـرینـا هزرا شانوگەریێ ئەو ژی:-

١ - نە زانی ئانکو کوراتی.

٢ - ترس ئانکو لالی.

٣ - زورداری و کوتـەکی ئانکـو قرالێ باژێری.

ل دوماهی‌یا شانوگەریێ نڤیسـەر بو مە ب درامـەیەکا جوان ئەمیکلا ژ بن دەست و پێیت تێـای هشیـار دکـەت. ئەگـەر ئەم بەرێ خو بـ دەینە دەرهێنـانـا ڤێ شانـوگەریێ، دێ بێنین دەرهێنەری بە شێوەیەکێ هەڤچەرخ ئەمیکلا بو بینەری پێش کێش کر، ئو پشت بـ چەند لایێت فەلـسـەفی و سایکـولـوجی یێـد دەقـی‌دا گرت بو، ئو زێـدەتـر ژ قوتـابخـانـەکێ بـ کار ئینا بو لێ قوتابخانا دەربرینی زێدەتر دناڤ دا بەلاڤ بو، دگـەل شانـوێـا هەژار (فـقـیـر) و شانـوێـا مەرج دار (شرطي) و مفا ژ ڤان دەرهێنەرێت جیهـانی وەرگـرت بو، هەر وەکی برایێ (فهمی) بو مە دناڤ دان و ستاندنەکێ‌دا دیار کری،

[ مایـرهـولـد - کروتـوشکی - بیتربروك] و دەرهێنان ژ سنورێت دەقی و جیهـانـا بەرچاڤ دەرکەفت بەرەڤ جیهانەکا هزری (فکري) و نە دیـار و نە بەرچـاڤ، وپـری








میکائیل ابراهیم



گوهدار تر



عمر علی



ابراهیم عیسی



تەرس و لەرز و چەند ڤیژیەك بوون دناڤ مێشکێ بینەریدا دەنگ ڤەددا، ئو گرنگیەکا زێدە دابو جهی و (الكتلة و الفضاء) دگەل وەختی دخزمەتا ویدا بوون. ئاڤاهیی یێ (منتدى المسرح) وەك بازێرەکی وەرگرت ژ بو تورا دەرهێنانێ (شبكة الاخراج) ئو هەر ژورەك دانا وەك مالەکێ ژ بازێری ئو گرنگیەکا

زێدەدابو جوقێ‌وەل بینەری کربو خو ل بەرشڤێت بەرزە بـ گەرت و بەرەڤ جیهانەکا ئاشوبی و فەلسەفی بزڤیت، هەر رۆژەکی بـ شێوەکی هاتە پێش کێش کرن و چ سنور ژبو نەبوون ، ئەم دشێین بێژین ئەڤ شانوگەریە چەند کەڤاێن شێوەکاری بوون ئو هەر بینەرەکی ل دویف رادێ تێگەهشتنا

خو ئەڤ کەڤال نە شروڤە دکر ، بێ گومان ئەنجاما جیاواز بو ل دویف جیاوازیا مروڤی .

ئەڤێ جوقاهە بـ بێ ئەزمانی ئەمیکلا بـ ئەزمان کر و دیمەنەکێ دلگێر بو روخسارێ شانوگەریێ پەیدا کر کریڤێ (فهمی) جوقە بو گەلەك پێتڤیا بـ کار ئینا بو، مینا (مللەت - تویی زەمان - وەرارا

تەکنولوژیا پێش کەفتی - کارتێکرنا ئامیرەتی ل سەر سروشتی - دیکور) ئەڤە و پشتی شەش رۆژا ئەمیکلا ئاخفتی گەلەك زانا و رەخنەگر و شانوڤانێت عیراقی لێ ئامادە بوون.

بشکدارێت ئەڤی کاری ئەڤە بوون:

(نورسین - عمر علی - ابراهیم عیسی - مجید حسو - ادیب حسین - گوهدار تمر - میکائیل ابراهیم - شمال اسماعیل - شعبان سلیمان-نصر الدین هادی شرمین احمد - هیڤی علی - رێبر عمر - حمید عجیل - جمال سلیم - ئاری عبدالله) چاڤدێرێ هونەری (فخري العقيدي).

ل دوماهیکێ هەژیە و جهێ رێز گرتنێیە سوپاسیێت تیپا شورەشڤان - بگەهینمە: دەزگەها روشنبیری و بەلاڤ کرنا کوردی ل بەغدا بو دەست گرتن و ئالیکاریا وێ بو تور و هونەرێ کوردی کە دەستەکێ بەرز و بالا هەبو بو پێش کێش کرنا ڤێ شانوگەریێ .

دیسا سوپاس بو تیپا شانویێ عیراقێ ل بەغدا کو دەرگەهێ هولا خو بو تیپا شورەشڤان ڤەکری.











# وەرزش لە کوردستاندا لە گەشانەوەدایە

لەم چەند ساڵانەی دواییدا، تیپی یانەی وەرزشی هەولێر هەنگاوی چاکی ناوەو چاوەڕوانی ئومێدی سەرکەوتنی زیاتری لێ ئەکرێ، بەتایبەتی لەڕووی تۆپی پێ کە تا ئێستا توانیویەتی زۆر یاریزانی لێهاتوو لە بواری وەرزش دا بگرێتە خۆی..

لەوانەش یاریزان [ سەرکار علی خان] کە هێرش بەری یانەیە لە گۆرەپانی مەشق کرندا ووتی:

* لە منداڵیەوە حەزلە وەرزش دەکەم بەتایبەتی تۆپی پێ، تا ساڵی ١٩٨٢ کە لە تیپی یانەی هەڵبژاردەی هەولێر وەرگیرام.

* بیروڕات چییە بەرامبەر بەباری وەرزش لە هەولێر بەتایبەتیو لە کوردستان بەگشتی؟

- بەرەوتەکان دەڕوات.. گەلێك بەهرەی گەش لە هەموو بەشەکانی وەرزش دا دەبیندرێن کە پێویستیان بەدەست گرتن هەیە، بەتایبەتی لە بواری شەترەنج و پایسکیل و ئاسن بەرزکردنەوە، جگە لە تۆپی پێ.

* هۆی دوورکەوتنەوەی یانەی هەولێر لە ریزی یانەکانی (پلەیەك) چیبوون؟

- یەکێك لەو هۆیانە دوورکەوتنەوەی فێرکەری یانە مامۆستا محمد خلیل کە وای کرد یانەکە بەبێ فێرکەر بمێنێتەوە، کەم وکورتی هەندێ لە یاریزانەکان کە تیپەکەیان بەجێ هێشت.

* دەربارەی ناوبژیوانەکان چی ئەڵێن؟

- زۆربەیان پشتگیری یانە گەورەکان دەکەن، ناوبژیوانی دەوڵەتی صلاح محمد کریم بە یەکێك لە چاکترین ناوبژیوانەکان ئەزانم.

* ئەی جوانترین یاری خۆت؟

- جوانترین یاریم لەگەڵ یانەی [بحری] کە لە هەولێرکراو لە ئەنجامدا لە قۆناغی یەکەم ٣ - ١ بردمانەوەو من گۆڵی یەکەمم کرد.

* جوانترین گۆڵت؟

- جوانترین گۆڵم، گۆڵێك بوو لە یانەی - رەشید - کە لە یاریگای شعب کرا.

* کام یاریزانت بەدڵە لە کوردستان؟

- یاریزان شاخەوان مجید و طارق عبدالرحمن لە هەولێر و محمد کریم لە سلێمانی.

* حەز لە دەنگی کێ دەکەی؟

- حسن زیرەکی نەمر.

* جگە لە وەرزش؟

- گەلێك حەزلە مۆسیقا دەکەم

* تاقە ئاواتێك؟

- لە هەڵبژاردەی عیراق یاری بکەم.

* گۆڤاری [ رەنگین] ت دیوە؟

- زۆربەی ژمارەکانیم دیوەو لە ناخەوە پێی گەشامەوە.

●شێرزاد - هەولێر●



# به ئیمزاکەت خۆت بناسە!





● أمیر عبد الله فتح الله، تۆ پیاوێکی سەرکەوتووی بە ڕەوشت و پەروەردەی باشت پیاوێکی لێ دەرئەچێ و ئەگەر لە سەر ئەم بارەی ئێستات بەردەوام بی و نەگۆڕێیت، ئەوا بەرەو ژیانی ئاسودەو کامەران ئەچیت، پیرۆزبایتان لێ ئەکەم.



● شیروان محمد طاهر پیرۆ، تۆش لە هەوڵی بە دەست هێنانی ژیانی کامەرانی و خۆش گوزەرانی دای، بەلام هێشتا ماوتە، تۆزێکی تر خۆت سادە تر بکە، هەوڵ بدە هەڵس و کەوتت تۆزێ ڕێك و پێك تر بکەیت، بۆ دووا ڕۆژت باشە.



● محمود کچك، تۆ تۆزێ ترسنۆکی، جار جار حەز لە واقیعیەت ئەکەیت بەلام چونکە ئەترسی، هیچت بۆ ناکرێ و هیچیشت بۆ نا وترێ.



● ئامانج عمر محمود، برام، دنیا ئەوە ناهێنێ تۆ ئاواخوتی پیوە خەریك بکەیت، تۆزێ بیر لە ژیانی کەس و کاریشت بکەرەوە، هاوبەشی خۆشی و ناخۆشیان بکە بۆ دووا ڕۆژی خۆت باشە.



● وریا عبد الله رشید، تۆ زۆر حەز لە لێ پرسراوی و ناو بانگ ئەکەیت، حەزت لە ڕواڵەتی زرق و برق هەیە، تۆزێکیش تورەیت، ڕەنگە ئەگەر وا بڕۆیت نەگەیتە ئامانج.



● جلال أنور رسول، تۆ دنیات بە فشە وگاڵتە داوەتە بەر، حەز لە ماڵ و سەروەت ئەکەیت، بەلام چونکە نازانی چۆن پەیدای بکەیت دەستت داوەتە لاقرتی و بێ تاقەتی لە زۆر لایەنەکانی ژیان تۆزێ خۆت کۆ بکەرەوە.



● کەیوان محمد رضا، تۆ زۆر واقیعیت، حەز لە جوانی و ڕێك و پێکی هەموو لایەنەکانی ژیان ئەکەیت، هەر ئیشێك ئەکەیت لە بەر پەلە پەل لە دووایی‌دا سەر لە خۆت ئەشێوێنی، وا نەکەیت باشە.



● ابو بکر محمود، من تێ ناگەم تۆ ئەو هەموو پێچ و پلوچە چی‌یە خستووتە خۆت بۆ وا خۆت معقد کردووە، هەموو دەورو پشتت لێ ئیزعاج بووە، ئەگەر ئەتەوێ سەرکەوتوو بیت، تۆزێ خۆت سادە بکەو هەمیشە پێ بکەنە.



● کامەران نشأة بکر، تۆ نازانی چۆن خۆت پێ بگەیەنی، وا ئەزانی گەیشتنە ئامانج بە ڕواڵەت و کەش و فش ئەبێ، باشە ئەی نابێ حیسابێك بۆ تێکۆشان و هەوڵ دان بکەیت، سەبرو تاقەت بۆ مرۆڤ شتێکی باشە.



● سۆران کمال غفور، ئێوە بیر لە ژیان زۆر ئەکەنەوە، بە هەردوو دەست باوەشت کردووە بە دنیاداو خۆت معقد کردووە، مرۆڤ سادە بێ باشترە تورەیی سەرکەوتن لە کیس ئەدا.

ئیمزا

ناو ---------------

ناونیشان ---------------

# یەکەمین و بەناوبانگترین خوم خانە لە سلێمانی









هەرچەندە شارەزای خوم خانەکە بووین بەڵام پێش ئەوەی خۆمان بگەیەنینە لای پرسیارمان کرد بزانین ئایا راستە ئەمە یەکەم خوم خانەیە هەموویان لەسەر ئەو رایەبوون کە قادری حاجی رشید یەکەم خوم گەرە لە سلێمانیدا ... ئێستا لە سلێمانیدا دوو خوم خانە هەیە ئەویتریان پێشتر شاگردی وەستا قادر بووە ...
حەزمان کرد پێش ئەوەی ئەم پیشە سازییە کۆنەی کوردەواری لەبیربکرێت و نەمێنێت بە هۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاوە ئەم لێدوانە لەگەڵ کاك قادر حاجی رشیدی خوم گەردا تۆمار بکەین.

● سەرەتا دەربارەی ئیشەکەو سەرەتای وتن:
- شوێنی ئەم کارەپێی دەڵێن خوم خانە بە مانای رەنگ کردن دێت بە خاوەنەکەشی دەڵێن خوم گەر، ئەم کارەمان لەسێ پشتەوە بۆ ماوەتەوە من لە باوکم ئەویش لە باپیرمەوە ئێمەش یەکەمین خوم گەرین لە سلێمانیدا، دوکانێکی تریش هەیە کاك حسن جاران شاگردی خۆمان بووە.

● چی رەنگ دەکەن و چ رەنگێکتان هەیە:
خوریو هەموو جل و بەرگێك رەنگ دەکەین هەموو رەنگەکانیشمان هەیە ... هەرچەندە ئێستا رەنگ کەم بوەتەوە زۆر بە ئاسان دەستمان ناکەوێت

● چۆن رەنگ دەکەن:
- بەگوێرەی ئەو شتەی کە رەنگی دەکەین ئاو دەکەینە مەنجەڵێکەوەو دوو کەوچك خوێو کەمێك لەو رەنگەی دەمانەوێت رەنگی تێدەکەین، پاشان سێ چارەك دەکوڵێنرێت دوایی هەڵیدەکێشین تا وشك دەبێتەوەو رەنگ دەگرێت
.

● ئێستا ئیش چۆنە لەگەڵ سالانی رابووردوودا:

ـ ئیشمــان لەچــاو سالاَن دا زۆر کزە، خەلَکیش خۆیـان فێـربـوون ڕەنـگە دەکـرن و لە مالَـەوە خۆیان ڕەنگی کەل وپەلیان دەکەن.

**● کەس یارمەتیت نادات لەم کارەدا:**

ـ نەخێـر هەر خۆمم منـدالَەکانیشم نایەن چونکە کارەکە پاك و خاوێن نی‌یەو گرانە.

**● ئەو شتـەی باوەڕت پێ‌ی نی‌یە لە کارەکەت دا:**

ـ زۆر جار هەنـدێ ئافـرەت دێن ئەوانـەی زاواکـەیـان لەگـەلَیـان دا خراپـە گوایـە سیحـری لێ‌کـراوە هەنـدێ ڕەنگـاوی شین دەبـەن بۆئـەوەی زاواکـەیـان دەستی لێ بدات یاخـود پەنـجـەیـەکـی بەربکەوێت و ـ سیحرەکە بەتالَ بێتەوە.

**● ئەی دەلَێن پەڕۆی شینتان هەیە بۆ دەرمان:**

ـ بریتی‌یـە لە پارچـەیـەك خامی بچـکـۆلـە لە ڕەنـگـاوی‌شـین هەلَ کێشـراوە بۆ بازەلَـە (غـازات) باشـە دەخـرێتـە سەر سکی مندالَ چاك دەبـێـتـەوە ڕۆژی سەدەهـا ئافـرەت دێـن و دەلَـێـن سودیـان لێ‌ووەرگـرتوە. حەزدەکەم شتێکت بۆ بگێـرمەوە کوڕێکی دووکان دار لەم گوزەرەدا دەسـتـی بیـرۆی لێ‌هاتبوو زۆر پزیشك گەڕا چاری نەبـوو کەچی پەڕۆی شینی خستـە سەر چاك بوویەوە.

**● هێشتا لێدوانەکەمان تەواو نەکردبوو ئافرەتێك هات وتی پەڕۆیـەکـی شیـنـم بدەنـێ ویـستـمـان وێـنـەیـەکـی بگـرین وپـرسیاری لێ‌بکەین ڕازی نەبوو بۆی دەرچوو.**

**● هێرش محمد امین ●**

# سەردانێکی عەیادەی دکتۆر نۆشدارە

## ـ گۆڤاری ڕەنگین ـ

**● عبد القادر بابان ●**

### هەفتەنامەی یەکەم

مامـەقـالـە : کاکـەگیـان زۆر نەخـۆشم ناتـوانم خۆم بگرم بەپێوە بەهیمەت بێ، یان بەقیمەت بەلَکو ڕەقـەمێکی نزیکم بدەیتێ چەنـد دەلَێی دەیخەمە سەرچاوم

دەرگـاوان :ـ باشـە (١) دینـارم بدەرێ بۆ خۆم و (٥) دیناریش بۆ دکتۆر.

مامـەقـالـە :ـ ئەرێ برای باش لەکـەیـەکـەوە پارەی عیـادە زیادی کردووە خۆ هەنـدێ دکتـۆر (٢) دیناربوو؟

دەرگـاوان :ـ کاکـە ئەمیش وەك کەلە وپەلی بازاڕی ڕەش

مامـەقـالـە :ـ نەخـۆشی ناوبـازاڕ ئەمانیشی گرتەوە؟

دەرگـاوان :ـ لەسـەری مەڕو ساتێ لەش ساغی هەموو دنیا دێنێ

دکتۆر : پاش تێ‌ڕوانینی سەرپێی فەحـــی میـزو، پاشـەڕۆ و چوارتیشك

تاقیگا : ـ (٤) دینار.

تیشك (١٦) دینار.

دەرمانخانە : ٣/٨٢٥ فلس.

دکتـۆر: هیچت نی‌یـە ئەنجامی فەحـسـەکـان و تیشکـەکـان پاکن دەرمـانـەکـان بەرێـك وپێکی بەکـاربێنـە ئەگـەر چاك نەبـووی سەرم لێ‌بدەرەوە.

مامـەقـالـە: خوا کاسبیـەکی باش بدات منیش دەبێ بۆ هەن بگەڕێم

ئەنجام

١ دینـار+٥ دینـار+٤ دینار+١٦ دینار+٣/٨٢٥ = ٢٩/٨٢٥ دینار

( مانگی دوو عەیادەی وا پیاو چاك نەبێتـەوە ئەوەنـدەی تر نەخـۆشی هەژاری دەیکوژێ)

### هەفتەنامەی دووەم

### ـ گۆڤاری ڕەنگین ـ

ئای کە تامـەزرۆی گۆڤـاری ڕەنـگـینـم باخـۆم بگـەیـەنمـە کتێبخـانـەی (د) تاسیـاوی خۆمـە نۆیلَێی دانەیەکی بۆ دانەنابم.

مامەقالە :ـ ئەم کاتەت باش باشێخ ڕەنـگـیـنـێـکم بدەرێ‌و پارەکـەی وەرگرە فەرموو.

خاوەن کتێبخانە : ـ نیو دینار دەکات

مامەقالە : بۆ باوکم (٣٥٠) فلس نرخـەکـەی خۆی نی‌یـە خاوەن

کتێبخـانـە :ـ لەگـەلَ گۆڤـارێکی منداڵان دا دەیفرۆشم

مامـەقـالـە :ـ باشـە باوکم ئەوەش (١٥٠) فلسی تر هەر دەسم کەوێ قەیتـاکـات، (پـاش سەیـرکـردنی گۆڤـاری منـدالاَن نرخـەکـەی کوژاوەتەوە بە قەلَەم جاف)

ئەرێ کاکـە خۆ گۆڤـاری منـدالاَن نرخـەکـەی کوژاوەتـەوە ئەرێ بەراست نرخـەکـەی لە ڕاستی‌دا چەندە؟

خاوەن کتێبخانە : ـ کاکە بێ‌دەنگە بە پێنە نایفرۆشم ئەم مشت ومڕەت لەچی‌یە؟

مامـەقـالـە :ـ باوکم ئەمن دەنگە و ئەتۆش دەنگە دەلَێی مەیانی سەوزە فرۆشـەکـانـە چاك فرسـەت دێن ئەمـانیش کەوەر لەگـەلَ کەرەوزدا دەفرۆشن

( ئەم جارە کێ بەرپـرسـیـارە بەرامبـەر بە گۆڤـاری ڕەنگین بۆ ڕەنگەکەی تێك دەدەن )؟؟؟

# ئێمەو دەست و خامەڕەنگینەکان

## ئەشێ و ناشێ

هەرنامەیەکان بەدەست بگات ئێمەی دەستەی نووسەران ئەیخوێنینەوەو دەنگی لەسەر ئەدەین چا ئەو کەرەستانەی بۆمان دێن یان بۆبڵاوکردنەوە ئەشێن و یاخود ناشێن. ئەونووسینانەی بۆ ڕەنگین بشێن وا ژمارە لەدوای ژمارەدا بەپێی دەرفەت بڵاوئەکرێنەوە، ئەوی بۆ ڕەنگین نەشێن و بۆ (هاوکاری) یان (بەیان) بشێن ئەوا بۆ ئەو دوو بڵاوکراوەیە ڕەوانەی ئەکەین، ئەو نووسینانەی بۆ هیچ کام لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری نەشێن وا هەڵ ئەگیرێن ونادرێنەوە دەست خاوەنەکانیان.

لەم ژمارەیەدا ئێمە پوختەی کارنامەی ئەم حەوت ژمارەیەتان ئەخەینە ڕوو هەڵوێستی ڕەنگینتان لەئاستی کەرەستەکانتان بەم جۆرە شی ئەکەینەوە و ناوی کەسیش نابەین

یەکەم : ئەو نووسینانەی بۆ ڕۆژنامەی (هاوکاری) ڕەوانەکراون: (یاسای مافی مرۆڤ، شێوە چێشتە غەریبە، هەڵوێستی پیاو بۆ ئافرەت، ڕۆژنامەکان گۆڤارەکان، سامی عەودال، ئەیانزانی دەبم بەزێر، ئەی تۆڵانە ، گەر ئەمزانی، چیرۆکی لالۆ، ماڵ ئاوایی ، ژیان، یادێک، دوا بریاروەڵامی پرسیارێکی پیرەمێرد، هاوینە هەوارەکەم، سۆزیت دوریت، شەماڵ، ئێوارە دیمەنێک، سەری ساڵی نوێ، جێیم هێشتی، وام دەزانی، شەپۆلە بەزەییەکان ،، دەست بڵاوی، دەنگت هەرینە، دوو چیرۆکۆکە دابەشکردنی ڕێسا یاساییەکان، باڵندە کۆچەرەکان، پەیدابونی یاسا، بۆچی کۆرپەڵە لەبیر دەچێت، گیا بوگەنە ، کانگەکانی ئەفەریقا، ئیمپریالیزم و ڕاگەیاندن، وجودیەت، لەشیعرەکانی پیرەمێرددا، مێژووی کورد لە گۆڤاری نزاردا، بیتهوڤن، هونەرمەند مولکی کێیە، من منالێکی زیرەکم، بارهێنانی منداڵ، دەربارەی فۆلکۆر، داب و نەریتی کوردەواری، زانستی فۆلکلۆر، دڤێت کەلەپوری، ئافرەت و منداڵ، بەرنامەی وەرزیش، ترۆسکەی ڕاستی، بۆ کاک شێخ محمەدی صۆڵەیی، ڕێژەن بناڤی، کۆرپەی دڵ، هەواڵێکی بێدوان، بەڵێن بێبانە، دیوە شولەکە، بخوێنە

دووەم ـ ئەو نووسینانە ی بۆ گۆڤاری (بەیان) ڕەوانە کراون (بیرەوەرییەکی هونەری، سمایل خانی شکاك، مۆسۆلێنی چۆن کوژرا) ئەی هاودەمی تەنیایی، بێ ناونیشان، هەرکە هاتی، مرنا زانا قەناتی کوردو، چەردەیەك دەربارەی ژیان، خۆشناوو خۆشناوەتی، کاتێ کە مێژوو دەچێتە سەرشانتۆ، ئوسکاری ساڵی ١٩٨٨، لایەنێك لە ژیانی زریابی هونەرمەند، یەکێك لە ئەدیبەکانی ئەمەریکا)

سێیەم: ئەو کەرەستانەی بۆ بڵاوکردنەوە ناشێن نەلە (ڕەنگین)و نەلە (بەیان)و (هاوکاری)دا ئەمانەی خوارەوەن: (دواهەمین پاشای میسر، خەمی ڕوبار، کار چییە؟ هەوڵ مەدە کات بکوژی، ڕوانگەیەك، کورتە چیرۆکێك، پرسیار، گەردوونی بەیانە، ماڵ ئاویی لە ژیان، سامان پەرست، بیتاقە، شیعرێکی قانع ، پادشای نینۆك، ئەستێرەی زەوی، ئایا تۆ نەخۆشی دەرونیت هەیە، کەشتیوانی ئاسمان چی ئەخوات، سەرنیشان، کۆلارە، وێنە کێشان بەهۆی کامیرەوە، سۆفیا لۆرێن، چەند وێنەیەك، شاگوڵ ، لەسەر مانگە گیران میثیما، تیپی لاوانی زێرەگە هاوریکانی ژیانم، بەهەڵە چوبوم شتە جوانەکان چون ئاغا بوویە. . . بروسکە ، سەڤا، کچێکی دڵ جیوە، شەڤا کارەش، دوو چیرۆك، پەخشان، یادی نەورۆز ، هیڤی ئەز، ئارمایی ڕێبوارێك، سێ پارچە، دووربونەوەی یار، منیش دەڵێم، شەیدای مۆسیقام، ئاوداران.






دووکورتـه چیرۆك، کریکاری، ڕزگاری، ڕەش و سپـی، چواریـیـن، حەزت ئەکـرد، خۆزگـەی شیعریك، ژیان)

**بۆ** لەمـەولا : خوینـەرو نووسـەرانی بەریـز، ئەوا هەشت ژمـارەی ڕەنگیتـان خوینـدەوەو **لەناوەڕۆك و ڕیرەوی گۆڤارە کەتان گەیشتن، ئەو کەرەستەی بۆ ڕەنگین ڕەوانـە ئە فەرمـون ئەبیت ئەم مەرجـانـەی خوارەوەی تیدا کۆببیتەوە:**

**١ ـ کورتـە بابـەت بیـت و لە سێ چوار لاپـەڕە** تێپەڕی نەکردبیت.

٢ ـ وینەی ڕوونکردنەوەی **لەگەڵدا بیت،** وینەکان ڕەنگاو ڕەنگ بن چاکترن.

٣ ـ بواری شیـعـرو چیـرۆك لەڕۆژنـامـەو گۆڤـارەکـانیتـرماندا **زۆرە،** لەهەر ژمارەیەکدا لە یەك دوو پارچـە شیعـرو چیـرۆك بەولاوە دەرفـەتمـان بەدەستەوە **نی‌یە بیورن ئەم دوو** بابەتەمان بۆ مەنیرن

٤ ـ ئەو بابـەتـانـەی **بۆ ڕەنگینی ئەنیـرن** ڕەسـەن و بلاونـەکـراوە بن، ئەگـەر **بلاوکـرا بنـەوە سەرچـاوە** دیـاری بکـرێ **بەدروستی، بەمـەرجێ ڕۆژنامەکانی** خۆماڵی **نەبن.**

**٥ ـ ئەو بابـەتـانـەی بۆڕەنگین ئەشێن ئەمـانـەن** (ژینـامە، **یادداشت، بیرەوەری،** هونەر، فۆلکلۆر) چاوپێکـەوتن کۆمـەلایـەتی، ئابـووری، ئافـرەت **منداڵ زانـست** هتد. . .) بەلام بەشیوەیەکی سوك و **ڕەوان و نوێ**

٦ ـ بەخـەتیکی جوان و لەسـەر دیـویکی کـاغـەزو **خەتیش جێ** بهیلرێ.

**٧ ـ ئەوەنـدە مەکـەنـە سەرمان بۆ زووبلاوکر**دنەوەی **مادە کانتان تەنگمان لێ هەڵ مەچنن.**



**خوینـەرانی بەریـز، لە میـژووی** ڕۆژنامەنووسی کوردیدا ڕووی نەداوە گۆڤاریك (٣٥) هەزار دانەی لێ چاپ بکـریت و پیشـەکی پارەی سی‌هـەزاری درابـێ، ئەمـە دەسـت کەوتیـکـی گرنگـە ئەبیت بەهـەمـووان هەوڵی پاریـزگـاری کردنی بدەین و **بکـۆشین بۆ ئەوەی بەرەو پیشـەوە بچیت،** ئیمـەی دەستـەی نووسـەرانی ڕەنگین هەمیشـە لە خزمـەت ئیـوەی خوینـەرو نووسـەری کورددا دەسـت لە **سەرسینـگ ڕاوەستـاوین چاومان لە ئیوەیەو** گویمان **لە دەنگی‌زوڵاڵ و ڕەسەنی وشەی کوردی‌یە .**

بیست ساڵی ڕێك لەمەوبەر لەو دەوروبەری ماوەتە بووم، لەگەڵ کۆمەڵە هاوڕێیەك دا کەوتینە سەر هەواو هەوەسی ئەوەی، گەشت و سەیرانێك بۆ ئەو سەرانە سازبکەین، بۆ ڕۆژی دوایی، دەنگە بڵاوبوو کە حسن زیرەکی گۆرانیبێژ لەناو ئاواییدایە، ئەوەندەی پێنەچوو، هەڵ کشا بەرەو ژوورو هاتە لامان. کە هات هەر خۆی نەبوو. کۆمەڵی کوڕوکاڵیشی بەدواوەبوو. بۆ یەکێکی وەکو ئەو پێویستیی بەوە نەبوو خۆی بە کەس بناسێنێ، هەر زۆری پێنەچوو ڕوویان لێ نا گۆرانیو بەستەیەك بڵێ. ئێستاش وا ئەزانم دوێنییە یەکسەر «کیژان دەچنە مێرگوڵان»ی تیچڕاند. دیار بوو لەو گۆرانی بێژانە نەبوو کە نازونووز دەکەن و بیانوو دەگرن. کە تیچڕاند وام زانی دەنگەکە لە لووتکە سەرکەشەکانی چیاکانەوە هارە دەکەن و دەدەن بە گوێم دا. دەنگێکی نێر تێکەڵ بە جۆرە گڕییەکی بەسۆز، هەمووانی خستە سەر هەوەس و ئارەزوویەکی تەلیسماوی، هەمووانی هەژان، هەمووانی بزوان. دوای ئەوە دەنگی لێهەڵ بڕی بە چەند گۆرانیو بەستەیەکی تر ئێمەش و خۆشی مەست کرد. من بۆم دەرکەوت ئەم پیاوە وەکو بۆ خۆی بڵاوێنیەوە، وەکو خۆی ژیرکات، وەکو





ئاوپرژێنی دڵی هەڵ قرچاوی خۆی بکات، ئاوا حەزی لە گۆرانی‌یە وەکو بڵێ: «خەڵکە منەتی چیتان بەسەردا بکەم، من خۆم کەیفم بە گۆرانی‌یەو بۆ خۆمی دەڵێم» زیرەك وەك بتی گۆرانی‌و بەستەی کوردی پەرستێت وابوو، بۆیە بەرامبەر ئەو بتە بەچۆك دا دەهات و بەگۆرانی ویردو سڵاواتی بۆ دەخوێندو نوێژی بۆ دەکرد. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بردمی بۆ ئەوەی روو بکەمە هاورێکانم و بڵێم: «ئێوە سەیرکەن، چۆن ئەم هەلە لە دەست دەدەین، ئەوا سبەی دەرۆین و کاك زیرەك جێ‌دەهێڵین.» کە گوێی لەم قسەیە بوو، وتی: «کاکینە ڕاستی‌یەکەی من میوانی ئێوەم و بۆ لای ئێوە هاتووم، زۆر خۆشحاڵم دەکەن، ئەگەر بە هاورێی خۆتان قبوولم بفەرموون.

هەر شەو لەگەڵ ولاخدارێك دا پێك هات کە بەیانی بە سواری بکەوێتە تەکمان. گەشتەکەمان سێ شەوی خایاند، نەدەکرا هەر هەمووومان تەنیا لە یەك شوێن دابەزین و داکرێین، کە دەمەو ئێوارە گەیشتینە ئاوایی‌یەك، کاری داکردن و دامەزراندنی میوانەکان کەوتە ئەستۆی من و ریش سپی ئاوایی‌یەکە. کاك حسن زیرەك هاتە بن دەستمەوەو بەبێ دەنگی پێی‌وتم: کاکە ئەمن بۆ خۆم وام پێ‌خۆشە لە هەر ماڵێك دامەزرایت منیشت لەگەڵ بم. نیوە ڕۆژانیش هەر لەتەك من دا لە ماڵێك تیکەیەك نانمان دەخواردو لێمان دەداو دەرۆیشتین. بۆ ئەو ماوە کەمەش کیژان روویان دەکردە ماڵی خانەخوێکەمان، زیرەك بە گۆرانی خۆشەوە، بە بەستەی بەجۆشەوە، دەی‌خستە دنیای عەشقێنی پڕ خرۆشەوە. بە هەر گوندێك دا تێ‌پەڕ دەبووین، کوڕو کیژی هەرزەکار دەهاتنەپیرمانەوە، بە ڕوویەکی خۆش و ساکارەوە دەیان پرسی: توخودای ڕاستە حسن زیرەکتان لەگەلە، کا..، کامەیە؟!!.

تا گەیشتینە دوا مەڵبەندی گەشتەکەمان، چ شەو و چ ڕۆژ، ئەمە هەر گۆرانی‌و بەستەبوو، شەوانیش گەلێك بەسەرهاتی خۆی‌و باسی دنیای بۆ دەگێرامەوە، قسەکانیم بەلاوە زۆر سەیرو سەمەرە بوو.

تا ئێرە تێکرا هەر باسی‌گەشت و سەیرانەکە بوو، بەڵام لە ڕاستی‌دا ئەم بیرەوەری‌یەم بەو نیازە نووسی کە بەهرەیەکی تایبەتیم لەو هونەرمەندە مەزنە دی کە لە هەموو باس کردنێکی‌دا دێتەوە یادم. سەرم سوڕدەمێنی، ڕادەمێنم. ئەوەش سەیرە کە تا ئێستا بەش بە حاڵی خۆم نە بە دەمی نە بە نووسین، نەم بیستووەو نەم دیوە. تەنانەت «میرزاکەریم»یش لە هەردوو بەرگی کتێبەکەی‌دا لە بارەی (حسن زیرەك)ەوە لەوە نەدواوە. بۆیە وا من ناچارم بۆ مێژووی هونەری کوردی ئەم ڕازە بدرکێنم و بیژنم بەسەر ئەم کاغەزەدا.

لەو سێ شەوەدا کە بە یەکەوە بووین، دەکەوتینە دەمەتەقێ، بەڵام ئاخ لە دەست شەکەیتی ڕێگا، نەی دەهێشت تا درەنگانێك دانیشین، وەنەوز ملی دەشکاندین، باوێشك گوێی کپ دەکردین.

خەو وەڕسی دەکردین، تەنگی پێ‌هەڵ دەچنین، ناچار خرپ خەومان لێ‌دەکەوت. یەکەم شەو نەم زانی شەو چ وەختە دەنگ و ئاوازێك وردەوردە خەوەکەمی ڕەواندەوە تا خەبەرم بووەوە، ڕاستی‌یەکەی نەختێك سڵەمیمەوە! نەختێکیش شڵەژام! چاوێکم گێڕا، هیچم نەدی! دەنگەش هەر بەردەوامە، بە چاوی خەواڵووەوە هەرچونێك بوو، سەرنجێکم دا، سەیر دەکەم، حسن زیرەکە بە ئاوازێکی ناسك و نزم و نەرم بە گوێی شەوی کش و مات دا دەچرپێنی. وام زانی بەخەبەرەو بێ‌دەنگ لە سەر شوێنەکەی خۆی گۆرانی دەڵێت. دوو سێ جار دەنگم لێ‌کرد، دەنگی نەبوو. بەلامەوە زۆر سەیر بوو، ناچار بە ئاگام هێنا، وتی ئەوە چی‌یە کاکە؟!، وتم کاکە بلێم چی.. وەخت بوو شێت بم!، وتی بۆ؟! بەسەرهاتم بۆ گێرایەوە، پێکەنی‌و وتی: «کاکەگیان، ئەوە من هەروام، بەدەم خەوەوە گۆرانی دەڵێم، (میدیای زەندی)ی خێزانم کە ئەمەی لە من دی (زەبتل صەوت)ێکی «تۆمارکار»ێکی دانا، ئەم «گۆرانیی بە دەم خەوی شەوانەوەیەی» زەبت دەکرد. بۆ بەیانی کە لە خەو هەڵ دەستام، بۆی لێ دەدامەوە، سەیردەکەم هەندێك لەوانە شیعرو ئاوازی نوێن، خۆشم بۆ یەکەم جار دەیان بیستم، لەبەر ئەوەچەند جارێکم دەوتنەوەو نەختێك پوختم دەکردن و لەناو خەڵك دا دەبوونە گۆرانی‌و بەستەی تازە داهێنراو. ئەمەش وا نەبێ هەموو شەوێك بێ، جاروبارە، وا ڕێکەوتی ئەم شەوی کرد.» -

● فەرەیدون علي إمین●

# کە وێنە مێژوومان بۆ دەگێڕێتەوە






لەوانەی راوەستاون (لەچەپەوە بوراست)

١ - شێخ محمدی گولانی
٢ - حەمەی ئەورەحمان ئاغا
٣ - سید نوری نەقیب
٤ - عزت بەگی وەسمان پاشای جاف
٥ - صالح زەکی بەگی صاحبقەران
٦ - قادر ئاغای حاجی مەلا سعید

دانیشتوەکان:

٧ - شێخ محی الدین شێخ قادر
٨ - عونی أفندی گورون
٩ - شێخ نوری شێخ صالح
١٠ - عبد الله عادل
١١ - احمد بەگی وەسمان پاشای جاف
١٢ - حمە سعیدی حمە رەشید بەگ
١٣ - شێخ قادری سەرکار

( ئەم وێنەیە سالی ١٩٢٠ وەرگیراوە)

دانیشتوان - لەچەپەوە بۆ راست:
(حەمە صالح بەگ، توفیق وهبی، عزت توفیق تۆپچی، رشید مەستی رسول)
راوەستاوەکان - لەچەپەوە بۆ راست.
(رشیدی حاجی فرج بەگ، فؤاد رشید بکر، علی توفیق قەفطان، شێخ (سلام)ی شاعیر، رشید صدقی، رۆژنامەنووس محمد بریفکانی، رؤوف شێخ صالح، علی بەگی عثمان بەگ، شاکر سید حکیم، حەمە صالح سعید، عزت حاجی أمین)
ئەم وێنەیە لە سالی ١٩٤٨ لەسلێمانی وەرگیراوە



قوتابیانی قوتابخانەی ناوەندی فیصلیە لە سالی ١٩٣١دا ئەوانەی لێیان ناسراون:
لەدانیشتوان (احمد صالح، (جلال)ی امین بەگ، فایق فرج، رووف سید نوری نەقیب، مجید رشید بکر، شوکت میخوار).
لە راوەستاوەکان (مامۆستا رشید زکی کابان، عبدالرحمن کریم، عبدالرحیم عبدالکریم، مصطفی توفیق بەگ، عزیز أحمد ئاغا، عزیز جو، توفیق رشید حاجی فرج، قادر ئاغای حاجی مەلا محی‌الدین، محمد مجید کانیسکان، فؤاد صالح قفطان، عبدالخالق خالد)







# هیچیش نافرۆشێت کەچی واز ناهێنێت

لەپانتایی دوو دوکان تەنها شوێنی کورسیەکەی خۆی ماوە ،کەلوپەلی کۆنە قەڵاچن کراوە تا بنمیچی دوکانەکان . . .لەوانەیە شتی .٣ ساڵ لەمەوپێشی تیا بێت .خۆشی نازانێت چی تێدایە . . . .هەر شتە کۆنەی کڕیوەو فڕێی داوەتە دوکان . . .گوێی لێ نەبووە ئایا ئەم شتەی دەیکڕێت دەفرۆشرێتەوە یان نا. . . ئەوەی سەیرە لەم دوکانەداە شتی نوێ نابینیت هەمووی کۆنەیە . . سەماوەرە شکاو، تەنەکە، قوتو، شووشە، مەنجەڵی مس، تەشت، قۆری، سەتڵ، . . . هتد



چووینە بەردەم دوکانەکەی کاك توفیق یونس محمد لە سلێمانی هەندێ لە شتەکانی ورد بووینەوە، پاشان مەرحەبامان کرد، دیار بووزۆر بێتاقەت بوو، هەندێ پرسیارمان لێکرد:

**● خاڵە چەند ساڵە ئەم دوکانەت هەیە وبازاڕ چۆنە:**

- نزیکەی ... ساڵ، دەبێت خۆشم لەدایکبووی ١٩٦٢م لە سلێمانی جاران باش بوو بازار هەبوو خەڵکی فێریان زل نەبوو و شتی کۆنەیان دەکڕی بەڵام ئێستا بە مانگیش شتێك نافرۆشم مەگەر چۆن ها

**● ئەی بۆ وازی لێ ناهێنیت**

- بەخوا حەزم هەر لە شتی کۆنەیەو تواناشم نەماوە کاسبی تر بکەم.

**● کرێ دوکان چەند دەدەیت:**

- مانگی ٨ دینار دەدەم

**● باشە خەرجی خۆت وماڵەوەت دەردەهێنێت:**

- کوڕە نەوەڵا دەری ناهێنێت، منداڵەکانم یارمەتیمان دەدەن.

**● هێرش محمد ●**

وەلام دانەر: رحاب

# چارچییە

عیلاجی دەردی دڵ (ناری) لە (طاهر بەگ) تەمەننا کە

بێ ئەمرو گوڵەندامی بەتری حەرگی پەی‌کردین

## کەرەلوول

نامەیەکمان لە خوشکە بێچارەوە پێگەیشتووە، وا پوختەیەکی لێرەدا بڵاو دەکەینەوە:

**من کچێکم لە پۆلی چوارەمی ئامادەیی‌دا، گەنجێکی رێکوپێکی هاوپۆلی خۆم** خۆش ویست، پاش چەند مانگێك لە خۆشەویستی **نێوانمان داوام** لێکرد کە بێتە خوازبێنیم، بەڵام کەسوکارەکەی بەقسەیان نەکردو زۆر سەرزەنشتیان کرد، بەو پێیە کە ئەو هێشتا قوتابی‌یەو زۆری ماوە خۆی پێبگەیەنی‌و بەئامانجی خۆی بگات. **ئیتر** ناچار بووین واز لەیەك بێنین و ئەو پێوەندی‌یە ناردارەی نێوانمان بپچڕێنین دوای ساڵێك واتا لە پۆلی پێنجەمی ئامادەیی لاوێکی دی سەرنجی راکێشام و پاش ماوەیێکی کەم رازی دڵی خۆی لا **در**کاندم کە خۆشی دەوێم، **سەرەتا نەم ویست تاقیکردنەوەی** یەکەمم دووبارە بێتەوە، بەڵام **رۆژ دوای رۆژ پێویستی وای لێکردم خۆشم بوێت و هۆگری بیم، کاتێك کە ساڵ تەواو** بوو، ئەنجام وەرگێڕایەوە، سەرنەکەوت. ئیتر وازی لە خوێندن هێنا. ئێستاش **لەوە** دەترسم کە بێتە خوازبێنیم کەسو**کارم رەتی بکەنەوە بەو بیانووە کە خوێندنی تەواو نەکردووەو خاوەن** هیچی خۆی **نی‌یە.**

بەدبەختی لەوە دایە تووشی گەنجەکە**ی** یەکەم جار بوومەوەو ویستی هاموشۆم بکات و سەر لە نوێ پێوەندی ببەستینەوەو پەیمانی **پێدام کە هەتا ئەگەر** کەسو**کاریشی** رازی نەبوون ئەو هەر بم هێنێ.

لە راستی‌دا من داماوم **و** نازانم چ بکەم. **ئەگەر دروش** نەبێت من حەزم بەلای گەنجەکەی دووەمە

دەی، **ئەی گۆڤاری** خۆشەویست.. رێنمایم بکە **چی بکەم** باشە. ئیتر سوپاس

خوشکتان

بێچارە لە **سلێمانی**

## وەڵام

خوشکۆلە. **تۆ لەو** بڕوایەدا نیت **کە هێشتا لە چاو ئەم** جۆرە **تاقیکردنەوانەدا منداڵیت؟ تۆ قوتابیی، قوتابخانەیت و لە نامەکەت دا دیارە کە لە خوێندن دا باشیت و کەسوکاریشت جۆرە پێوانەیەکیان هەیە بۆ ئەو کەسانەی دێنە خوازبێنیت و تۆ خۆشت ئەوە دەزانی کە ئەم مەرجانە لەو دوو لاوانە هیچیان نایەتە دی. کەوابێت** بۆچی دەچیتە ناو ئەو تاقیکردنەوانە کە پێشەکی دەزانین سەرکەوتوو نی‌یە

**من نالێم خۆشەویستی حەرامە. یان تۆ هەقی ئەوەت نی‌یە هاوبەشی ژیانت هەڵبژێریت، بە پێچەوانەوە** هەڵبژاردنێك **کە لە سەر بناغەی بتەوو سەرکەوتوانە بێت ئاواتی هەموو مرۆڤێکە. بەڵام هێشتا رێگات لە بەرەو کاتی ئەوەت ماوە** ئەم ئامانجە **بێتە دی. پاشان هیچ** مەرجێکیان **تێدا نی‌یە کە پێویستە لێیان دا بێتە دی، کەوا بێت سەر سامی‌و داماوی بۆ چی‌یە؟**

**تۆ کچێکی ژیرو قوتابی‌یەکی** زیرەکیت، **دەبێ خوێندنی خۆت تەواو بکەیت و هیوای کەسوکارت بێنی‌یە دی بە چوونە زانکۆوە، وە پێویستە کەسایەتی‌و پاشە رۆژێکی باشت هەبێت.**

**هەرچی ئەو پێوەندیانەی هەتە** بیان پچڕە چونکە **پێوەندی‌یەکی** هاوتا نی‌یە چۆن گەنجی **یەکەم** گەڕایەوە لات کە دەش زانی **تۆ لەگەڵ یەکێکی تردا پێوەندییت بەستوە؟، ئەم کارە دەبێ وریات بکاتەوە.**

**سەرسامی خۆت بڕەوێنەوە بە گەڕانەوەت بۆ چاودێری کردنی پاشەڕۆژت، پاشەڕۆژیش** لەبەردەمتایە، پەلە مەکە. **ئەوەی** کە ئێستا تووشت دەبێت گەردە لوولێکی کەم خایەنەو نامێنێ.

## دڵداری‌و پارەی بەقەرز

**من کچێکم تەمەن ٢٨ ساڵی، فەرمانبەرم لە دایەرەیەکدا، بەر لە دوو ساڵ گەنجێکم ناسی‌و دڵم گرتی، ئەگەرچی خوێندنی تەواو کردبوو بەڵام نەیتوانی بوو کاربکات.**

**ئیتر رێکەوتین کە دوارۆژ بۆ خۆمان بە ئاواتەوە نەخشە بکێشین، جار بەجار دەهات داوای پارەی دەکرد دەم دایێ، چونکە وام دەزانی رۆژێ لەرۆژان دەبێتە هاوسەرو هاوبەشی ژیانم، بەڵام رۆژێك هات داوای پارەیەکی نەختێ زۆری کرد بۆ ئەوەی کەلوپەلی ماڵی دوا رۆژمانی پێ**

**بکرێت. بوسبەینێ پارەکەم بۆ هێنــاو بۆی دەرچــوو. جا لەو ڕۆژەوە نەهـــاتـــەوە لام ناچـــار چوومە لای دایکیو مەسەلەکەم تێگـەیـانـد. دایکی بڵێ چی باشـە؟ گوتی: وا کورەکـەم بەم زوانـــە ژن دەهێنێ. کێ؟ من؟ نا!. ئەوەنـدەی نەمـــا بوو بیـوورێمـەوە. هاتمەوەو وازم لێ هێناو هەواڵەی خوام کرد. پاش سێ مـــانگ ڕۆژێ هاتـــەوە لام لەدایـــەرە بەڵام ئەم جارە دەرم کردو تۆڵەی ئابرووی خۆم لێسەندەوە.**

**گیــرو گرفتـەکەم ئەوەیە، کە ئێستـا پارەکـەم ناداتـەوە دایکم پێم دەڵێ: بیــدە دەست خواو واز لە پارەکـــە بهێنـــە منیش دامــاوم، نازانم چیبکـەم. ئایا لە دایـــەرەی پۆلیـس شکــاتی لێبکـــەم. یان بەقـــەی دایکم بکەم؟**

**ر.م. عەمبار**
**سلێمانی**

## وەڵام

خوشکی بەڕێز، کە تۆ کچێکی وا خوێندەوارو تێگەیشتوویت چۆن توانی بەم ڕێگە نابەجێیانە پارەت لێ دەربهێنێو فێڵت لێ بکـــات؟ ئەی نەدەبـوو جارێك لێی بپرسیت بۆچی ئیش ناکات و ئەی چۆن ماڵ پێکـــەوە دەنێت؟ گوایـا بە تەمای مەعـاشەکەی تۆ بووە کە ژن بێنێو دوا ڕۆژ بۆ ماڵ و منـــداڵی دابیـــن بکات؟ ئەی هەر جارە کە بۆ پارە دەهاتەوە لات بیانووی تازەی چی بوو؟ چۆن هەستت بە فرۆفێڵی نەدەکرد!

چاکترین چارەسـەرو چاکترین ئامـــۆژگـــاریـــی من ئەوەیـــە ئەم خۆشـــەویـستـییـە لە بیـــر خۆت ببـــەرەوە، بەتـایبەتی کە تۆ کچێکی جوانیت (هـــەروەکـــو نووسیـــوتـــە)و خوێنـدەواریت و مەعاشەکەت باشە ئیتـر بۆچ لە پاشـەڕۆژ دەتـرسیت؟ بێگـــومـــان کوڕێکـی چاکـت بۆ هەڵ دەکـەوێ کە ڕێـزی دڵچاکیو ڕەوشتـەکانت بگرێت.

بەڵام بۆ پارە وەرگرتنـەکە، ئەوە دەبێ سەربکەیتە سەردایکی بەڵکو کورەکـــەی خۆی ئیقنـــاع بکـــات پارەکـــەت بداتـــەوە. با بە چەنـد جارێکیش بێت. بەڵام ئەگەر هەر نەی دایتـــەوە، چۆن دەتـــوانی لە دادگا داوای لێ بکەیت کە بەڵگەو شاهیـدت نەبێت؟ دەمێنێتـەوە سەر خۆیو ویـــژدانـی خۆی! ئەگـەر ویژدانی نەبزووت خۆخوا هەیە لە سەر

## ژن هێنانی دووبرا لە دوو خوشکان

ئێـمــــە دوو برایـــــن، لە قۆناغێکی خوێندنی باش داین، باری کۆمـــەڵایـــەتیو حاڵــــەتی داراییمان باشە دوو کچی خاڵی خۆمـــان خۆش ویـــســـت و کەســـوکـــارمـــان چووتـــە خوازبێنییـــان، بەڵام واقمـــان وڕمـــا کە گوتیـــان شوومـــان پێ ناکـەن ویستمان بزانین بۆچی؟ **پاش** ماوەیەك، تا دەهات زیاتر **خو**شـــەویستی ئەم دوو کیـــژە خاڵـــە **لە** دڵـــــــان دا گری دەکـــردەوە. جاری دووەم و سێیەم و زۆر جاری تر داوامان کردنـــەوە ، هەر نەیـان کرد تا بیـــستـمــــان ئەوە دوو گەنـــج چوویشە داخـوازییـان و پێیـان **ڕازی بوون و** لێیـــان مارە کراون. ئاگرمان گرت، چۆن وا دەبـــێ؟ ئەی خاڵـــم چۆن ڕازی بووە کچی خۆی بداتـــە بیـانی؟ بۆیە ئەگـــەر جوویشە لای دوو ... ـمان گوتن کە ئێمە لێ ناگەڕێین ئەوان ئەو دوو کچە بهێنن جا لە ئەنجامی چەنـدو چوون دا چییان ویست دامانێو وازیان هێنا.

خاڵیشمـان بە مەسـەلـەکەی **زانی،** کەچی هێشتا کچەکـان ئێمەیان ناوێو شوومان پێ ناکەن.

پێمان بڵێن چی بکەین تا دڵیان نەرم بکەین.

براپان لە شاری هەولێرەوە
یوسف و یونس بلباس

## وەڵام

کەســـی برایـــنـــە! تێ ناگـــەم بۆ ئەوەنـــدەی ئادەگرن؟ گوایـا دنیا کچی تێدا نییـــە، کە ئێـوە باری کۆمـــەڵایـەتیو داراییشتان باشـە؟ کاکـــی یوسـف و کاکـــی یونس، خۆشـــەویـستی بە مەرجێـــك شین دەبێو بەر دەگرێ ئەگەر لە هەردوو لاوە ئارەزوو هەبێـــت. بەڵام خۆشـــەویـــــستــیـــی یەك لایـــی خۆشەویستییـەکی لا سەنگە و ناتەواوە و پێویستە لە ئاستی خۆیدا بوەستێ، چونکە کۆتایی بۆ نییە! هەتـاکـــەی وازیـــان لێ ناهێنن، جارێك و دووسێ داوا تان کردن شوویـــان پێنـەکـردن، گوایـا هەر چاوەڕوانی زیـاتر هیـچ دادیکتـان نەدات؟ تاکەی چاوەڕوان دەکەن؟ باشـــاڵ بۆچی نەچـوون هۆی ڕاستی بپرسن... یا خاڵتـان پێتان بڵێ هۆی ئەو... لێوە چییە!

برا ئەزیـــزنـــە، زۆر جار دەبێ خۆمـان عەیبێکـمان دەبێت، ئێمە نابینین و خەڵکی دی دەیبینن و لە کاتی هاتوچـــۆو هەڵســـوکـــەوت دا بۆیان دەردەکەوێ. هیچ دوور نییە کچەکـان هەندێ شتیان لە ئێوە بەدی کردبێت کە لای ئەوان پەسند نییـــەو ناشـــوێـــرن بە ئاشـــکـــرا بیدرکێنن، لەوانـەشـە خاڵت ئەوە بزانێ هەر بۆیـە بوو بۆ شووکـردنی کچـەکـانی بە دوو کوڕە بیانییەکە بەرهەڵستی نەکرد.

ئامۆژگاریم ئەوەیە واز لەو دوو کچـــە بهێنن، کوڕینـــە بێبـــەش کردنیان لە شووکردن بەشەرع زۆر حەرامـــە، بۆخۆشتـان بگـەڕێن لە لایـــەکـی دی ژن بهێنن ئەوەش بزانن کە قانـــون ڕێ نادات ئێـــوە نەهێڵن کەس ئەو دوو کچـە خاڵـــە بهێنێ ژیـریو هێوریو باڵ قووڵی بۆ مرۆڤ لە هەموو شتێك باشترە.

# ڕابەری خۆ جوان کردنی پیاوان

ئیمە وا ڕاهاتووین کتیب و نامیلکەی ڕەنگاوڕەنگ بخوێنینەوە کە باسی چاکترین ڕێگەی ئارایشت و گەش و تەڕیی پێست و دەموچاو دەکەن، بەلام لەم دواییەدا چاپی تازەیان بو پیاوان تەرخان کردووە.



ئەم کتیبەش باسی داوو دەرمانی ئارایشتی پیاوان و چۆنیتی بەکارهێنانیان دەکات وەکو بۆیەی برۆ و کلی چاوان و ڕێوشوێنی قژ بۆیەکردن و بەکارهێنانی لەوەنتەو بۆنی خۆش.

ئیتر هەر مەپرسە ژنانەیی پیاوان گەیشتووەتە چ ڕادەیەك، لە ئەنجامی باری ناهەمواری کۆمەلایەتی ئەورووپادا. دوعا بکەن لیی بەدوور بین.



## جوانترین ڕەنگ

گوڤاری «ژنە بەریتانیایی» لەم دواییەدا ڕاپرسینیکی ڕێك خست و لە هەزارو پینسەد ژنی پرسی کە بۆ جل و بەرگیان چ ڕەنگیك هەل دەبژێرن.

ئەنجام، وەلامی تیکرایی هەلبژاردنی ڕەنگی ڕەش و پەمەیی ئاودار بوو بۆیە کارگەو کۆمپانیاکانی جل و بەرگ زوو کەوتنە خۆ بۆ هێنانە بازاڕی

کومەلی نەخشەی هەمە جوری ڕەنگ ڕەش و ئال لەو جل و بەرگانەی کە کریاران زۆر دەیان کرن





# پیشاندانی جل وبەرگی دروینی نایاب

له پاریس، دەزگاکانی دروینی نایاب گەلێ نموونەی جل وبەرگی ئاهەنگ و شەونشینی تایبەتیان پیشان دا کە دەستکردی بەناوبانگترین نەخشەکێش و بەرگدرووانی جیهان بوون ئەمڕۆ ئەم هونەرە زۆر بایەخی پێ دەدرێت و کۆمەڵێک شارەزاو ئەندازیاران کاری لێ دەکەن.

فەرموون ئەمە هەندێ نموونەی ئەم پێشانگایانەن.



میکال سمیثی پزیشکی ئینگلیز ژنان له خۆدانە بەر هەتاو وریا دەکاتەوەو دەڵی زور ژن بۆ ئەوەی رەنگی پێستیان تووج رەنگ یان سەوزە رەنگ بێت بە رووتی لەبەر هەتاو لێی رادەکشێن، ئەمەش زیانی هەیە. چونکە تیشکی هەتاو سێ جۆرە، لە هەموان مەترسیدار تر ئەوەیانە کە رەنگی پێست سوور هەڵدەگەرێنێو دەیکا بە تووج رەنگ، کەوا (بۆیە - شانەکانی) پێست دەوروژێنێو دەیگەێنێتە رادەی سووتاندن.

هەر پزیشکەکە دەڵی وا چاکە بە رۆنی فینک کەرەوە لەشی خۆیان بهەنوون. چاویلکەش لە چاو بکەن بۆ پاراستنی کۆرونیای چاو. کەوابێت ژنانی رۆژهەڵات دەبێ سوپاسی خوابکەن کە هەر لە سروشتەوە پێستیان سەوزەو ترۆج رەنگە



# منداڵ بوونێکی بێئێش

دکتور میشیل ئۆدنت، پزیشکێکە نەك هەر لە فەرەنسا بەڵکو لە جیهان دا ناسراوە. کەوا بیست ساڵە یەکە شارەزای منداڵ بوونەو نەخۆشخانەیەکی تایبەتی خۆی هەیە. ئەوەی زیاتر ناوبانگی بۆ پەیدا کرد ئەو وتارانە بوون کە لە چەند شارێکی جیهانیدا خوێندنیەوە، کە دەربارەی چاکترین ڕێگە بۆ منداڵ بوونێکی بێ ئێش و ئازار بوون.

پوختەی لێکدانەوەی دکتور ئۆدنت ئەوەیە دەبێ دەورو بەرێکی گونجاوو لەبار بۆ ژنی دووگیان ئامادە بکرێت، وەکو گەرموگوڕی، مۆسیقای هێور، وونی مێرد لە نزیکەوەو سەرباری ئامادەکردنی ئەو لانە تایبەتی‌یەی کە منداڵەکەی لێ دەبێ.

کە ژنەکە هەستی بە ژان کرد دەخرێتە ناو حەوزی ئاو شیرتێنەوە، تا کرژیی ماسولکەکانی منداڵ دانی زیاد ببێت و جۆرە سربوونێك بە لەشی بگات.

ئەوەی شایانی باسە، نەخۆشخانەکەی دکتور ئۆدنت بووەتە یانەیەك پیاوو ژنانی ئاووس لێی کۆدەبنەوەو لەگەڵ دکتۆردا دەکەونە وتووێژو پرس و ڕاوەرگرتن لە بارەی زۆر کاروباری پزیشکی‌یەوە هەر لەوێش دا گوێ لە پارچە مۆسیقا جیهانی‌یەکان دەگرن. ئەمەش هەموو بۆ هێورکردنەوەو ئامادەکردنی دەروونی ژنان بۆ منداڵ بوونێکی ئاسان

## ئامرازێك دژی پرخە پرخ



، دوو سەر لە سەر سەرینێك،

جاری وا هەیە تووشی کێشەی پرخو هۆڕی کاتی نوستن دەبن بەڵام ئەم هەواڵە مزگێنی دڵارامی‌یە بۆ ئەو ژنانەی کە پرخو هۆڕی مێردەکانیان لێ ناگەڕێ شەو بخەون. بەڵێ، زانایان ئامرازێکیان دروست کردووە کە لە ژێر گوێی خەوتوو دا دادەنرێت، هەر کاتێك دەستی بە پرخەپرخ کرد ئەم ئامرازە وژەیەکی نەرم دەست پێ دەکات بە مەرجێك وا ناکات کابرا لە خەو ڕاپەڕێ، دەنگەکە کەم کەم دەگاتە ژێری ناخ، عقل باطن، ئەوسا گورج پرخە پرخ ڕا دەگرێ.

ئیتر شەوێکی شادی پڕ ئارام!



## خولیای وێنەگرتن

پەیمانگای وێنەگرانی چین دووپاتی کردۆتەوە کە چینی‌یەکان لە هەموو نەتەوەیەکی تر زیاتر حەز بەوێنە گرتن دەکەن. هەرچی ئەبینین هەوڵ دەدا مانگی پارەیەك پاشەکەوت بکات تا کامێرەیەکی پێ بکرێت.

پەیمانگاکە دەڵێ بە ملیۆنان فلیم هەر ڕۆژە دەفرۆشرێت و کەلوپەل و ئامرازەکانی کامێرەو دەرمانی شوشتنەوەو چاپ و لێگرتنەوەی فلیمیش لە چین لە چاو وڵاتانی تردا ئێجگار زۆرەو ژمارەیەکی گەورە پێك دەهێنێ.



# وێنەکێشی دڕندەی ئادەمی

کلۆد جیـوردانـۆ یەکێکـە لەو هونـەرمـەنـدانـەی بە هۆی بەکـارهێنـانی ڕەنگـە ئاوییەکانەوە تەختە نیگاری سروشتیو بەتایبەتی گیانلەبەران دەنەخشێنێ.

بەڵام ئەم جارە، کچێـکی جوانی هێنـا، لە ماوەی چوار سەعـات دا بەهـۆی ڕەنگی ئاویی (هـەسـت نەورۆژێـن)ەوە کردی بە پڵنگێکی دڕنـدەی جوان. تەمـاشـاکـەران زۆر بەدڵـیـان بوو گەلـێـکیش چەپڵەی ئافـەرینیـان بۆ لێداو ناز ناوی وێنەکێشی «دڕندەی ئادەمی» یشیان بەسەر دابڕی.



## گیانلەبەران... لە جل و بەرگ دا

پارو پێرار، زیاتر ئەو پارچەو قوماشـانـە باو بوون کە گوڵـدارو ڕەنگـاوڕەنـگ بوون، بەڵام ئەم ساڵ وادیـارە وێنـەی گیـانلەبـەری دڕنـدە سـەرنـجـی خـەڵـك ڕادەکـێـشـن و جلوبەرگـەکـان دەنەخشێنن.

دەبـینـین، کـۆمپـانیـاکـانی جل وبـەرگ و قایش و پێـڵاوو هەگبـەو کەلـوپـەلی تر کەوتوونەتە پێشبرکێی هەڵبژاردن و نەخشاندنی جۆری دڕنـدەو جۆری ڕەنـگ و شێوەیان بەسەر بەرهەمەکانیانەوە، لەم ڕووەوە هەوڵ دەدەن نەخشەی

سەیـری وا پیش کەش بکـەن لەگـەڵ ئەو گیـانلەبـەرە دڕنـدانەدا بگونجێن کە فیکرەکەیان لێ وەرگرتوون.

# منداڵێکی لە خەڵك بە دەر



## بچووکترین کامێرە

خاتـوو کاتـریـن تومـسـینی ئەندازیار توانی بچووکترین کامێرە لە جیهـان دا دروست بکـات، کە درێـژیی یەکـەی ٤/٧ سم و پانیی ٢/٦ سم ە، قورسـایـیـشـی ٥٠ گرامە شارەزایان لەو باوەڕەدان کە پاشەڕۆژی ئەم کامێرەیە لە کۆڕی ئاسمـان گەڕیو نەشتـەرگـەری پزیشکیو چاودێـری کردن دا بە بایەخ دەبێت.

ئارتـەر منـداڵێکی فەرەنسایییەو تەمـەنی ٩ ساڵ زیـاتـر نەبـوو کە پلەی خوێندنی ناوەندی تەواو کرد زۆر سەرکـەوتـوانەو بێئەوەی پێی بە قوتـابخـانـەش کەوتبێو هیچ مامـۆستـایـەکیش دەرسی دابێت، مەگەر دایك و باوکی نەبێت.

بەڕاستی منداڵێکی بلیمەتە، لە تاقیکـردنـەوەی زیـرەکیدا (١٧٠) پلەی وەرگـرت کە تێکـرای پلەی زیرەکی گشتیی مرۆڤ ١٠٠ پلەیە.

لەو دواییـەدا چوو بۆ قبـووڵ بوون لە زانکـۆیـەکی ئەندازیاریی جیهانی، ئەوانەی پێکەوە لەگەڵیا داوای وەرگیـرانیـان کردبوو خاوەن باوەڕنامەی ماجستێرو دبلومی بەرز بوون ئەنجامی تاقیکردنەوەکە زۆر سەیـر بوو، کەوا لە نیـوان ١٧٦ کەس دا زۆر بە پلەیەکی بەرز دەرچوو.

ئەم زیـرەکـیـیـە لە خەڵـك بەدەرەی ئارتـەر ئەنـجـامی ئەو پێخـوێندنە تایبەتییەیە کە دایك و باوکی بۆیـان ئامادەکردووە. کەوا جوانـای باوکـی شارەزای دەروونـنـاس ڕێگـەیـەکی تازەی پەروەردە کردنی دۆزیـوەتـەوە کە یارمەتیی گەشە کردن و پەرە پێدانی توانـست و بەهـرەی زیـرەکی دەدەن بەڵام بەرنـادیـتـی دایـکـی کە نەخـۆشـەوانە لە نەخـۆشخـانـەدا دووپـاتی دەکـاتـەوە، هەرگیـز تا نەگـەیشـتوەتـە تەمـەنی چوارساڵی قەڵەم و کاغەزی لە دەست نەناوە.

هەرچی باوکـیـەتی، دەڵێ: کورەکـەم بەڕاستی بەهـرەدارە، بەڵام خوێنـدن و ڕاهێنـان و مەشق



پاڵـنـەری سەرەکـیـن بۆ پڕانی زیرەکیی ئارتەر، بۆیە بە باوکان و دایکـان دەڵێم دەبێ وریـای توانای ڕۆڵـەکـانیـان بن و تواناکـان پەرە پێبدەن و وەبەریان بهێنن.



# کێشەکردن چی یە؟

ئەو قرشەو قەسەرەی دوای دروێنەی گەنم وجۆ لە وەرزی هاوین دا لە ناو پەرێزەکاندا دەمێنێتەوە بێ‌گومان بێ‌سوود نی‌یە.

قرشە ئەو پەڵە خەرمانەیە کە بەداس دەدورێتەوە گوڵە؟ لە پووشەکە جیا نەکراوەتەوە، ئەوەش پێویستی بە کێشانەوە هەیە بۆ سەر جوخین تاکو بەجەنجەر ورد بکرێت و لە دوای کوتان شەن دەکرێت دانەوێڵەکەمان جنگ دەکەوێت.

بەڵام قەسەر ئەو پووش وپەڵاشە وشکەیە لەدوای دروێنەی بە ئامێر چنگ دەکەوێت گوڵەکانی لێ‌جوێ بۆتەوە تەنها پاشماوەیە بەئامێری نوێ ورد دەکرێت کە بۆئەم مەبەستە دروست کراوە پووشەکە دەبێتە «کا» «کا» ش دەکرێتە ئالەفی مەروماڵات و یان بۆ سوتاندن یانیش لەقوردەکرێت بۆ سواغ دانی خانوو تاکو قلیش نەبات

وە گواستنەوەی ئەو قرشەو قەسەرە جاران بە ئامێـ ـی خۆماڵی بچوك لەداردروست کراو کە لەسەر پشتی وڵاخ گیر دەکرا پێی دەوترا «شەغرە» دەکێشرایەوە. دوای پێشکەوتنی ئاستی زانستی جۆبیارەکانی ئەوکاتە ئامێرێکی تریان دروست کرد کە لەسەر تایە «پێنجکە» دەڕۆیشت پیان دەگوت عارەبانە کە بە وڵاخ رادەکێشرا وەکو ئەم وێنەیەی لە پێشدایە بەڵام دوای پێشکەوتنی تەکنولوجیای نوێ ئامێری کشتوکاڵی جوراو جور دروست کراون وەکو جاران ئەم عارەبانانە بەکار ناهێنرێن جگە لە دێهاتە دوورەکان نەبێت.

وەکو کێشە لەسەرەتای مانگی حوزەیران لە ناوچەکانی باکوری وڵاتماندا دوای دروێنە دەستی پێ‌دەکرێت.

وەپێش دەست کردن بەکێشە خەڵکی خاوەن خەرمان وپووش خۆیان ئامادە دەکەن شەنەو قەرانگ و کەل و پەلی عارەبانەو وڵاخ و کەژیو گوریس رێك دەخەن کەئەمانە هەموو پێویستی کێشەکردنن.

● عدنان کاکە ●



# قەڵای شیروانە..

تەماشاکە! شکۆمەندی باپیرانمان چۆن جێ دەستی خۆیان لەدێرزەمانەوە بۆ ئێمە بەجێ‌هێشتووە. ئاخۆ ئێمەش بتوانین وڵاتێکی سەرفرازو خاکێکی ئاوەدان بۆ نەوەی داهاتوومان وەکو ئەوان بەجێ بێڵین..؟؟.

تەماشاکە! شان وبازووی باپیرانمان لە «قەڵای شیروانە» چ نمونەیەکی «رەنجدان ودروستکردنیان» بۆ بەجێ‌هێشتووین؟



# ڕەنگین لە کتێبخانەکاندا

هێشتا کام لەژمارەکانی رەنگین کتێبخانەکانی کوردەوازی رەنگین نە کردبو.. لە خۆرا کە ئەمەش دروستە سڵ لەوە دەکرا ئاخۆ رەنگین لای خوێنەواری کورد چۆن خۆی پێناس دەکات..؟ رەنگە یەکەم ژمارەی تاوو توێ بکرێ‌و ئیتر ژمارەکانی داهاتوی بێ رەنگ وبۆ بکەوێ..!!

هەشبو لەو رایەدا بو کە ژمارە لەدوای ژمارە زیاتر خۆی دەرەنگێنی.. بەڵام بەڵگەیەکی متمانە کراوی لانەبو..!

ئێستاش کە ئەو ماوە دیاری کراوەی رەنگینی لە سەر پێ هەڵدە سەنگێرا هات و رابورد ئەوەتا لەزوربەی کتێبخانەکاند دوای ئەوەی رەنگین دەگاتەجێ بەیەك دوو رۆژی لە سەر جامخانەی ئەو کتێبخانانە دەنوسرێ «تکایە رەنگین نەماوە...»

ئەمەش وێنەی یەکێکە لەو راستیانەو هیوادارین هەر بەم شێوەیە رەنگین بەرەو پێشەوە بروات

● فریا ●

# تهنئة



● تطل علينا ذكرى ثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز المجيدة .. ونحن نعيش انتصارات قواتنا المسلحة التي حققتها على قوى الضلال والطغيان حكام طهران العنصريين.. في قاطع مجنون.. وتحرير الرواقم الستراتيجية في جبالنا الشم اهنئ بأسمي وبأسم فوج (١٥٧) دفاع وطني الرئيس القائد صدام حسين حفظه الله.. ونعاهد ان نبقى جنوداً أوفياء لتربة هذا الوطن العزيز .. نصد رياح الشر والحقد عن كل شبر من عراقنا العظيم.. ونصون المكاسب والمنجزات الرائعة..



عصمت دينو

مستشار فوج (١٥٧)



● بأسمي وبأسم كافة مقاتلي فوج ١٤ دفاع وطني نهنأ الرئيس القائد صدام حسين حفظه الله وجنده الميامين الاشاوس.. بمناسبة ثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز المجيدة.. وتحرير كامل اراضينا الوطنية من الخمينيين الاوغاد عملاء الامبريالية والصهيونية ..



مسعود كبير سورچي

مستشار فوج ١٤ دفاع وطني



■ بمناسبة اعياد تموز الخالدة .. وملاحم المجد التي سطرها مقاتلونا الابطال في مجنون.. وشمالنا الحبيب.. التي اذهلت الاعداء والاصدقاء .. بقدرة المقاتل العراقي .. نزف احلى التهاني واسمى التبريكات للرئيس القائد المناضل صدام حسين حفظه الله ورعاه.



فاضل مصطفى البرواري

مستشار فوج ٢٠٨ دفاع وطني

## مەتەڵی ژمارە ٨

کۆمەڵە شاخێك بەرزو گەردن کەش
ئاسمانی شینی گرتوەتە باوەش
چوارپێتی ئەوەڵ بڕێژێ ڕەحمەت
جوتیار هەڵ ئەستێ لەخەوی غەفڵەت
دوو مەعنای هەیە چوارو حەوت و هەشت
یەکیان ئەندامەو ئەویان وا لەدەشت
ژمارە هەشتەو مەتەڵ هەشت پیتە
بۆ ئێوەی خوێنەر (ڕەنگین) بەپیتە

کوبونی گرەوی ژمارە ..٨..

ناو ----------
ناو نیشان ----------
----------

گرەوەکەش

مەقامی (خاوکەر)ی کوردیە

## سەرەنجامی گرەوی ژمارە ٧

**یەکەم ـ ناصر محمد عزیز ـ سلێمانی ـ مامۆستایان ـ پیشەسازی ١٧ی گەلاوێژ**

دووەم ـ سعادە عزیز محمد أمین **ـ هەولێر ـ** گەڕەکی ئیسکانی نوێ. قوتابخانەی **ناوەندی** دیمەنی کچان

سێیەم ـ بهجت أحمد صالح ـ کەرکوك ـ گەڕەکی ئەلماس ١٤٥/٢٦

## ئەو نامانەی پشت گوێ ئەخرێن

١ ـ ئەگەر ناوی گۆشە لەسەر زەرفەکە نەنوسرابێت وەك وەك ( گرەو، سابسات، چارچییە، ئیمزا، یەکترناسین، چاوی جەماور، بوك و زاوا، هونەر، کیژۆڵە، پێکەنین، یەکتربڕ، فۆلکلۆر، هتد...)
٢ ـ ئەگەر لە نامەیەکدا دوو گۆشە هەبێت،
٣ ـ ئەگەر لە یەکترناسیندا وێنەی لەگەڵ نەبێت
٤ ـ پول و کوبون بۆ گۆشە دیاری کراوەکان پێویستە.
٥ ـ ناوی سێقوڵی و ناونیشان نەنوسرابێت.
٦ ـ کەرەستە بەخەتی ناخۆش نوسرابێت.

جائێتر ئەی جەماوەری ڕەنگین ڕەنگین ئێمە ئەم خالانەمان نووسیو گوناهتان بە ئەستۆی خۆتان و سێ‌چوار جارەشی ناکەینەوە ڕەنگین











١١ - شارێکی کۆنی عێراقە (پ) -

## ئاسۆیی

١ - نەخۆشی‌یەکە - مارکەیەکی جگەرەیە

٢ - پایتەختی کامیرۆن.

٣ - نۆتەیەکی مۆسیقی‌یە (پ) - پیتێکی ئینگلیزی‌یە.

٤ - ژێر - جۆرە قوماشێکە - ژمارەیەکە (پ).

٥ - ــــ

٦ - مێژوونووس و دکتۆرێکی بەناوبانگەو یەکەمین کەس بوو کە بروانامەی ناوکی هێنا لە ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاستدا.

٧ - ــــ

٨ - خۆشەویستی (بەزمانی عەرەبی) - مارکەی ماشینە (پ) - ژمارەیەکە (پ) - ژمارەیەکە (پ).

٩ - وەکوویەکە وشەی‌نە. (بەزمانی فەرەنسی).

١٠ - ڕۆژنامەیەکی کوردی‌یە.

## ستوونی

١ - مانگێکی ئینگلیزی‌یە - دراویکی کۆری‌یە

٢ - وڵاتێکی ئەوروپی‌یە.

٣ - وەکوویەکی - ئەو (بەزمانی عەرەبی)

٤ - نۆتەیەکی مۆسیقی‌یە - شوێنی ئاوپرژان - وەکوویەکە.

٥ - ــــ

٦ - نوسەرو ئەدیبێکی‌بەناوبانگی سۆفیەتی‌یە.

٧ - ــــ

٨ - وەڵام (بەزمانی عەرەبی) - پێوانەی دوور - وەکوو یەکە

٩ - وەکوویەکە - وەکوویەکە.

١٠ - ڕووبارێکی فراوانە کەئەمەریکای خواروو

١١ - ئەسیر (پ) - پایتەختێکی ئەوروپی‌یە (پ).

ئامادە کردنی

[ فایزە أحمد سعید] سلێمانی، سەرچنار



# پێشبڕکێ جوانترین منداڵ

# لەنێوان گوڵ و گوڵزارا



هێشو اکرم



شاسوو هەردی سلام مەنمی



دیدار و ئالا رفیق شوانی



کاروان رفعت حسن



نیان مدحت محمد



فدوى ، هشام ، عمر فؤاد السعيد .


تاڤگەو تریفە رەشید رجب


شانیا خەبات


احمد حسن محمد


شیرین عونی حسن


سروشت طه داراغای


ژوان حمه طاهر


بەناز ایوب حمه کریم


ئازیز طه داراغای


هۆزان اقدر

